**ناوی کتێب : مرۆڤ و ژیان**

**نوسەر : کاروان سلێمان کاکەمەد**

**بابەت : لێکۆڵینەوە**

**بەرگ : سێیەم**

**تایپ : کاروان سلێمان کاکەمەد**

**نرخ : دیاری یە**

**لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپارد نی (٦٧٣)ی ساڵی (٢٠١٨)ی پێدراوە.**

## چەند وتەیەك

خوێنەری بەڕێز٠٠ ئێستاوابەرگی سێیەمی ئەم كتێبەم دەخەمە بەردەستی ئێوەی بەڕێز٠ ئەم بەرگەش پێكهاتووە لەچەندین بوار دوورلەدرێژدادڕی و وشەی ئالۆز بەزمانێكی سادە وڕەوان ئەم كتێبەم نووسیووە بۆئەوەی هەمووكەسێ تێی بگات ، داواكارم لە بەڕێزتان بە چاوێكی برایانەو بەسینگێكی فراوانەوە وەری بگرن هەركەم وكورپییەكم هەبوولێم ببورن٠ ناونیشانی ئەم كتێبە دەلالەت لەژیانی مرۆڤ دەكات لەهەمووڕوێكەوە ئامانجم ئەوەیە لێكۆ لێنەوە لەسەرژیان بكەم وبیروڕاكانی خۆم دەربڕم٠لەبەرئەوەی لەزۆرڕووەوە بەدواكەوتووی دەبینم ڕەخنەم زۆر لەسەرهەیە٠هەركەس چۆن تەماشادەكات هەر بیروڕایەكی هەیە مەرج نییە لەگەڵم هاوڕابێ ، هەمووپەرتوكێكم خوێندۆتەوە لەهەربابەتێك نوسرابێ٠سوپاسی خۆم پێشكەش بەكارمەندانی كتێبخانەی گشتی هەولێردەكەم ، كەلەكاتی پەیداكردنی سەر چاوەدا زۆریارمەتی منیان داوە٠

كاروان سلێمان كاكەمەد

هەولێر - ٢٠١٩

**دەرمان ودەرد :**

**چۆن جەستەی مرۆڤ تووشی نەخۆشی دەبێت ، بەهەمان شێوە دەروون وئاکاریش تووشی نەخۆشی وتێکچوون دەبن٠درودی خوای لەسەربێ ، فەرموویەتی :** ((دب اليكم داء الامم من قبلكم الحسد والبغضاء ، والبغضاء هي الحالقة ، حالقة الدين لاحالقة الشعر ، و الذي نفس محمد بيده لاتؤمنوا حتى تحابوا ألا أنبئكم بشي ء اذا فعلتموه تحاببتم ؟ أ فشوا السلام بينكم )) رواه أحمد والترمذي **واتا : (( دەردی نەتەوەکانی پێش خۆتان کشاوە بۆتان ، کەحەسودی ورِق وکینەیە ، رِق وکینە دین ئەتاشێت تاشینی ئاین نەك تا شینی موو ، بەوکەسەی گیانی منی بەدەستە باوەرِدارنابن هەتا یەکترتان خۆش نەوێت ئایا شتێکتان پێ بلێم ئەگەرکردتان یەکترتان خۆش ئەوێت ؟ زۆرسلاّولەیەك بکەن))٠هەر وەها فەرموویەتی :** (( سيصيب أمتي داء الامم ، قالوا : يانبي الله وما داء الامم ؟ قال : الاشر والبطر ، والتكاثر والتنافس في الدنيا ، والتباغض،والتحاسد حتى يكون البغض ثم الهرج )) رواه الحاكم **واتا : ((نەتەوەکەی من لەپاشەرِۆژدا تووشی دەردی نەتەوەکانی تردەبن ، وتیان : ئەی نێردراوی خوا دەردی نەتەوەکانی ترچییە ؟ فەرمووی : شەرِفرۆشی ولووتبەرزی وهەوڵی زۆربەدەستهێنان ومونافەسەی یەکترکردن لەدنیاو رِق لەیەك بوون و ئیرەیی بەیەکتربردن هەتا ئەبێتە پەلاماردان ، لەپاشان یەکترکوشتن))٠هەروەها درودی خوا ی لەسەربێ ، فەرموویەتی :** (ان لكل داء دواء ، وان دواء الذنوب الاستغفار) رواه الحا كم٠**واتا :(هەموودەردێك دەرمانی هەیە ، دەرمانی گوناه وتاوانەکانیش تەوبەوئیستیغفارە) خوای گەورە فەرموویەتی :** (فمنهم ظالم لنفسه ومنهم مقتصد ومنهم سابق بالخيرات باء ذن الله) فاطر :٣٢ **واتا : (هەیانە ستەمی لەخۆی کردووە وچاکەی کەمەوگوناهی زۆرە،هە شیانە مامناوەندییە ، هەشیانە زۆرگەرم وگورِە لەچاکەکانی دا بەویست ویارمەتی خوا)٠هە روەها درودی خوای لەسەربێ ، فەرموویەتی :** (الندم توبة) أخرجه ابن حبان والحاكم٠**وا تا : (پەشیمانی تەوبەیە)٠هەروەها فەرموویەتی :** (أصل كل دواء الحمية) أخرجه ابن أ بي شيبة والبيهقي٠ **واتا : (بنەمای هەمووچارەسەرێك بریتییە لە خۆپارێزی) واتای ئەوە یە خۆپارێزی پێویستی بەهیچ چارەسەرێك نییە٠**

**یەکەم - خۆبەگەورە زانین :**

عن ابن مسعود عن النبي (صلى الله عليه وسلم) قال : (لايدخل الجنة من كان في قلبه مثقال ذرة من كبر ، فقال رجل : ان أحدنا يحب أن يكون ثوبه حسنا ونعله حسنة قال : ان الله جميل يحب الجمال ، الكبر : بطر الحق وغمط الناس) **واتا لەئیبن مەسعود ەوە لەپێخەمبەری خواوە (درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی : (ئەوکەسەی بەئەندازەی کێشی گەردیلەیەك خۆبەزلزانینی لەدڵدابێ ناچێتەبەهەشتەوە ، پیاوێك وتی : هەریەکێك لەئێمەحەزدەکات پۆشاکەکەی چاك بێ ونەعلەکانی چاك بێ ، درودی خوای لەسەربێ فەر مووی : خواجوانەوجوانی خۆش دەوێ ، خۆبەزلزانین بریتییەلەنکۆڵی کردنی حەق و بە سووك تەماشاکردنی خەڵك٠)دیارەهەمووئەوەی نەفس ئارەزووی دەکات حەرام نییە ، مرۆ ڤ حەزی لەوەیە بەجوانی ببینرێ بۆیەپرچی دادەهێنێ ولەئاوێنەتەماشای خۆی دەکات و جەمەدانییەکەی ڕێك دەخات٠بەڵام بەنسبەت ئافرەت بێگومان لەکاتی بینینی ئافرەت بە خۆڕازاندنەوە شەهوەت وئارەزوودەهەژێ هەرکەسێکیش وای ڕاگەیاند لەکاتی تەماشاکرد نی ئافرەت شەهوەت وئارەزووی ناهەژێ ئەوەڕاست ناکات٠هەروەهاخوای گەورە زەمی ئەو کەسەی کردووە ، کەشانازی دەکات وگەورەیی دەنوێنێ ، هەروەك دەفەرموێت :** {ان الله لا يحب كل مختال فخور} لقمان : ١٨ **واتا : (خواهیچ خۆبەزلزانێکی شانازیکەری خۆش نا وێت)٠وەك هەندێك کەس ، کەنەژادوبنەماڵەیەکی ناوداری هەیە بەبنەماڵەکەی خۆیەوەبنا زێت وبڵێ : من نەوەی فلاَن کەسم٠**

**خۆبەگەورەزانین ئەوحالەتە دەروونییەیە تیایدا مرۆڤ خۆی بەگەورە دەبینێت لەکەسانی تر٠هەتالەنێوژیانی هاوسەریش دا یەکێکیان بەهۆی شتێکەوە وەك جوانی یان بڕوانامە یا ن دەوڵەمەندی تووشی خۆبەگەورەزانین دەبێت وهاوسەرەکەی بەبچووکترتەماشادەکات٠ بۆنموونە ئەوخەڵکانەی بۆپۆز ئەوجۆرە ژمارانە دەکرن ، کەکۆدەکەیان (٤٤٥)ە یان ژمارەکان دووبارەیە نەك تەنهابۆمۆبایل ، بەڵکوبۆئۆتۆمبێلەکانیش پێیان خۆشە ژمارەکان ناوازەبن٠ کەسیمکارت هەبووە بە (٣) سێ دەفتەردۆلارفرۆشراوە تەنهالەبەرئەوەی ژمارەکان دووبارە یە٠(پۆزلێدان وشەیەکەلەبری خۆهەڵکێشان بەکاردێ)٠پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی :** ((يامعشر قريش ان الله قد أذهب عنكم نخوة الجاهلية وتعظمها بالاباء

أيها الناس: كلكم من ادم وادم من تراب لافخرللأنساب ، لافضل للعربى على الحجمى ولاللحجمى على العربى)) **واتا : ((ئەی قورەیشی یەکان : خوای گەورە دەماری نەفامێتی وخۆبەگەورەزانینی بەهۆی بنەماڵەوبنەچەوە لەناو ئێوە هەلگرتووە ، ئەی خەڵکینە ئێوە هەمووتان لەئادەمن وئادەمیش لەخۆڵەوە پەیدابووە ، جاشانازیکردن بەبنەچەونەسەب نا بێ هەبێ ، هیچ عەرەبێك لەعەجەمێك زیاترنییەوهیچ عەجەمێکیش لەعەربێك زیاترنی یە٠))**

**دووەم - هاوڕێی خراپ :**

**پێخەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی :** ((المرء على دين خليله فلينظرأحدكم من يخالل))٠

**هاوڕێیەتی پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتییە و مرۆڤ پێویستی بەهەڵبژاردنی هاوڕێ هەیە٠ هاوڕێیەتی گرینگە بۆژیان نەبوونی هاوڕێش کاریگەری لەسەرباری دەروونی کەسەکان هە یە ، بەلاّم هەڵبژاردنی هاوڕێی خراپ کارێکی مەترسیدارە٠(ت)دەڵێ : هاوڕێیەکی زۆرنزیکی خۆم ئۆتۆمبێلێکی بەنرخێکی زۆرهەرزان لەبن دەستم دەرهێناوە وگوتوویەتی هەرئەوەندە دەکات وداویەتی بەهاوڕێیەکی چەرچی خۆی٠**

**سێیەم - نەگبەتی (شووم) :**

**خوای پەروەردگاردەفەرموێ :** {ألا انما طئرهم عند الله}الاعراف : ١٣١ **واتا : ( لەکا تێکدا هەمووئەوشتانەی ئەوان بەشوومیان دەزانی تاقیکردنەوەبوو بۆبەندەکان لەلایەن خواوە بڕیاری لەسەردرابوو)٠درودی خوای لەسەربێ ، دەفەرموێ :** (لاعدوى ولاطيرة و لا هامة ولاصفر)رواه البخاري **واتا : (درمووپەتانییە ، بەیدوم ڕاست نییە ، بەیدوم بە هۆی مانگی سەفەرەوە ڕاست نییە)٠**(الطيرة) **بەیدووم واتا** (التشاؤم) **واتا (ڕەشبینی) ، نا وەکەی لە** (طيرة) **هاتووە واتا (باڵندە) ، چونکە عەرەبەکان بەهاتووچۆی باڵندەکان وهە ڵفڕینیان بەلای ڕاست وچەپ دا ڕەشبینییان بۆدروست دەبوو لەمەبەستەکانیان پەشیمان دەبوونەوە٠درودی خوای لەسەربێ کاریگەری ئەوباڵندانەی بەبەتاڵ دانا ، کەهیچ زیان و سوودێکیان نییە(وەکوڕەشبینبوون بەدەنگی قەلەڕەش وکونەپەپۆ و٠٠٠هتد)٠**

**پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی :** (الشوم في الداروالمرأة والفرس) **ئە**

سمای کچی عومەیس وتی : وتم ئەی پێخەمبەری خوا(درودی خوای لەسەربێ) شووم ونە گبەتی خانووچییە ؟ فەرمووی : شووم ونەگبەتی خانووئەوەیە ڕووبەری بچووك بێ وتە سك بێ (چونکەمنداڵ دەچێتەدەرێ وشەڕدەکەن ودەبێتەشەڕی خێزانەکان ، هەروەهائافر ەت دەچی لەبەردەرگادادەنیشێ ، چونکە بوونی ژووری تایبەت زۆرپێویستە لەبەرئەوەی هە ریەکەوحەزووئارەزووێکی هەیە یەکێك لەوانەیە ئارەزووی خوێندنەوەی هەبێ ئەویتر پێو یستەبنوێ ، یەکێکی ترگوێ لەگۆرانی دەگرێ بۆیە بەهۆی بچووکی خانووبەرە زۆرگرفت ڕ وودەدات) ودراوسێکەی خراپ بێ٠هەروەهابەدرودی خوای لەسەربێ گوترا شووم ونەگبەتی چوارپێ چییە ؟ فەرمووی : ولاغێك نەهێڵی سواری ببی و بە خراپی هەڵسووکەوت بکات وبجولێتەوە٠گوترا شووم ونەگبەتی ئافرەت چییە ؟ فەرمووی : ئافرەتێك کرداری خراپ بێ وبەخراپی ڕەفتاربکات٠کەواتە نەگبەتی خانووئەوەنییە کاتێك خانوێك دەکڕی یاخودکاتێك ئافرەتێك مارەدەکەی لەوکاتەدا ڕووداوێك ڕووبدات وابزانی بەهۆی کڕینی ئەو خانووە یان مارەکردنی ئەو ئافرەتە تووشی بەلاّبووی ئەوە بۆخانوو و ئۆتۆمبیل و ئافرەت بۆ منداڵیش هەمان شتە٠ منداڵی تازە لەدایکبوو یان خانوو یان ئۆتۆمبیلی تازە یان هاوسەرگیری لای هەندێك کەس بەمایەی نەگبەتی وبەلاّوناخۆشی دادەنێن٠(ش) دەڵێ : سەرەتاخانوێکمان کڕی هەموو ڕۆژ گرفتمان هەبوو ، هیچ ڕۆژێك بێ شەڕ و کێشە بەسەرنەبرد٠ منیش دەمگووت ئەو خانووە خێری پێوەنییە خانووەکەمان فرۆشت هەرچارەی نەبوو ،بەڵکوبەهۆی قەرزی زۆرەوە گرفتمان زیاتربوو دەمووت سەدخۆزگەم بە خانووەکۆنەکە بۆیە هاتمە سەرئەو باوەڕەی خانوو ، ئۆتۆمبیل بڕیارلەسەرژیانی ئێمەنادات٠(س) دەڵێ : بڕوای منداڵی پێ بێخێر شتێکی زۆربێ مانایە ، منداڵ خۆی فریشتەیە هیچ گوناهێکی نییە٠(م) دەڵێ : ڕۆژێك لەنەخۆشخانەی لەدایکبوون منداڵێك لەدایکبوو ، خەبەربۆخانەوا دەکەی هات کەباوکی منداڵەکە بەڕووداوی ئۆتۆمبیل گیانی لەدەست دا بۆیە ئەوخانەوادەیە هەرئەوڕۆژە منداڵەکەیان لەنەخۆشخانە بەجێهێشت گوتیان : ئەومنداڵە پێی بێخێرە٠ (م) دەڵێ : ئەوڕووداوەم بەچاوی خۆم بینی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆدواکەوتوویی هەندێك لەتاکەکانی کۆمەڵگەوزاڵبوونی داب ونەریت بۆیە ئەوقسانە هیچ ڕاست نییە٠هەندێك کەس بڕوایان وایە کە ژمارە (١٣) شوومە هیچ ژمارەیەك شووم نییە وە هیچ بنەمایەکی ئاینی

وزانستی نییه تەنهاخورافاتە ، بەڵکوجاران دەیانووت : لە ڕۆژانی سێشەممە نابێ پرچی خۆت بتاشی هەربۆیە پشووی سەرتاشخانەکان ڕۆژانی سێشەممەبوو لەگەڵ شارەزابوونی خەڵك لەدین دا ڕۆژبەڕۆژئەوخورافاتانە نامێنن٠

چوارەم – مەشرووب خواردنەوە :
{يأيهاالذين امنوا انما الخمروالميسر والانصاب والأزلم رجس من عمل الشيطان فا جتنبوه لعلكم تفلحون} المائدة : ٩٠(انما يريد الشيطان أن يوقع بينكم العدواة والبغضاء في الخمر والميسر ويصدكم عن ذكرالله وعن الصلوة فهل أنتم منتهون) المائدة : ٩١
واتا : (بەڕاستی شەیتان ئەیەوێت دوژمنایەتی وڕق وکینە بخاتە نێوانتانەوە بەئارەقخواردن وقومارکردن وە ئەیەوێت لەیادی خواو نوێژکردن وەرتان گێڕێت ئایا ئێوە وازتان هێنا)٠
(خ) ژنێکی تەمەن (٣٥) ساڵە ماوەی (١٠) ساڵە لەگەڵ کوڕێك هاوسەرگیری کردووە دوای بوو نی منداڵێك لەسەرمەشرووب خواردنەوە لێی جیابۆتەوە ، دەڵێ : ئەگەرمەشرووبی نەخوارد باوە کەس وەك ئەوباش نەدەبوو ، بەڵام کەدەیخواردەوە هەمووشەوێك بەسەرخۆشی دەهاتە وە ولێی دەدام وجنێوی سوکی پێدەدام ولاچاوێکی مۆردەکردمەوە ، کەبەیانی هەڵدەستاوە د ەیوت : بۆوات لێهاتووە ؟ منیش پێم دەگوت : تۆوات کردووە٠پەشیمان دەبۆوەوداوای لێبورد نی لێدەکردم ، بەڵام کە دەچۆوە نادی وەك خۆی لێ دەهاتەوەوهەمان شت دووبارە دەبۆوە٠
(ب) دەڵێ : مێردەکەم هەفتەی دووسێ شەولەگەڵ برادەرەکانی دەچێتەدەرەوە بۆمەشروو بخواردنەوە کاتێکیش کەدەگەڕێتەوە ماڵ زۆربەتوندی لەدەرگادەدات وژیانمان لێ تاڵ دەکات نیوەی شەودەست دەکات بەهات وهاوارمنداڵەکانم لەخەوڕادەپەڕێنێ یەکێ لەمنداڵەکانم بە پیرییەوەچووبوو کەچی پێلەقەیەکی تێهەڵدا سەری بەکەوەنتەری ماڵەوەکەوت وشکا کەچی بەیانی هەڵساگوتی ئەوەکێ سەری شکاندووە ؟! بەڵام ئەوەی ئێستاخۆشحالی کردووم ئەوەیە برادەرێکی تازەی مێردەکەم توانیویەتی کاریگەری وابخاتەسەری کەوردە وردەلەمەشرووبخۆ رەکان دوورکەوێتەوە٠ئافرەتێکی تردەڵێ : خاوەن شەش منداڵم خێزانێکی دەستکورتین ولە خانووی کرێداین خۆشم ناچارم بەگرێبەست لەیەکێك لە فەرمانگەکان دەوام بکەم یەکێك لەوڕووداوەناخۆشانەی کەبەهۆی سەرخۆشی مێردەکەم تووشمان هات ، مێردەکەم نیوەشەو ێکی درەنگ بەسەرخۆشی گەڕابۆوە لەجیاتی بێتەوەماڵی خۆمان بەسەردیواری ماڵی جیرانە

**کەمان چوبووە ژوورەوە ئەوانیش زۆریان لێدابوو وایان زانیبووکەبۆمەسەلەی نامووس چۆ تەئەوێ تاوای لێهات پۆلیسیش لێ ئاگادارکرایەوە ڕۆژی دوایی کەمێردەکەم ئازادکرا لەگەڕە کەکەڕۆیشتین ومێردەکەشم بەخۆی دا چۆوە جارێکی تربەسەرخۆشی نەگەڕایەوەماڵەوە٠ درودی خوای لەسەربێ ، فەرموویەتی : (الخمرأم الفواحش) یان فەرموویەتی : (الخمرأم** الخبائث) **٠ چونکە بەهۆی ئەوەی ئاگای لەخۆی نامینێ ئەکەوێتە زیناکردنیش ، چونکە کەعەقلی لەسەرنەما هەمووشتێك دەکات٠دەگێڕنەوە پیاوێك بانگ کراوە بۆئەوەی سەجدە بۆبتێك ببات قبولی نەکردووە ، پاشان داوایان لێکردووە نەفسێك بکوژێ قبولی نەکردووە ، پاشان داوای ئەوەیان لێکردووە زینابکات قبولی نەکردووە، پاشان داوایان لێکردووە مەی بخو اتەوە کەخواردییەوە هەمووئەوتاوانانەی کرد کەداوایان لێکردبوو٠درودی خوای لەسەربێ ، فەرموویەتی : (اجتنبوا الخمر فاءنها مفتاح کل شر) واتا : کلیلی هەمووخراپەیەکە٠ یانی دەرگای هەمووتاوان وخراپەیەك دەکاتەوە٠**

**پێنجەم – قسەوقسەلۆك :**

{یاأیهاالذین امنوا ان جاءکم فاسق بنبأ فتبینوا ان تصیبوا قوما بجهالة فتصبحوا علی ما فعلتم نادمین} الحجرات: ٦ **واتا : (ئەگەرکەسێکی فاسق هەواڵێکی بۆهێنان تەبەییون بکە ن ولەڕاستی ودروستی هەواڵەکەبکۆڵنەوە بەرلەوەی بەهۆی نەزانینەوە کۆمەڵێك سەرگەردا ن بکەن وپاشانیش پەشیمان ببنەوە)٠**

**قسەوقسەلۆك ماڵی زۆرخەڵکی وێران کردووە ، لەڕووی ئاینیشەوە دەبێ خەڵك لەقسەوقسە لۆك دووركەوێتەوە ، چونکەزیانی بۆخەڵك هەیە٠گۆڤاری سڤیل لەژمارە (٢٤٧)ی ساڵی ٢٠١٤ دابلاۆیکردۆتەوە : تەرمی کچێك لەپزیشکی دادی هەولێربووە ، کەدوای کوشتنی لەلایەن بر اوئامۆزاکەیەوە باوکی بۆزانینی ڕاستی ودروستی ئەوقسەوقسەلۆکانەی خرابووە پاڵ کچەکە ی بووبوونەهۆکاری کوشتنی ، بەلاَم پزیشك پێی ڕاگەیاندبوو کەکچەکەداوێنپیسی نەکردوو ە٠بەپێی گێڕانەوەی کەسانی نزیك لەڕووداوەکە ماوەیەك بەرلەکوژرانی کچەکە دراوسێ ود ەوروبەری ئەوماڵە قسەوقسەلۆکیان لەدووهەڵبەستووە٠**

**شەشەم – لەباربردنی منداڵ :**

{الشيطان يعدكم الفقر ويأمركم باالفحشاء} البقرة: ٢٦٨ **واتا : (شەیتان دەتان ترسێنێ بەهەژاری وفەرمانتان پێدەکات بەخراپە)٠لەباربردنی منداڵ بەهەمووشێوەیەك حەرامە تەنیائەگەرپزیشك هۆشداری دا ، کەدووگیانی کاریگەری هەیەبەسەرتەندروستی دایکەکەو دەبێتەهۆی مردنی٠زۆرئافرەت بۆئەوەی کۆرپەلەکانی ناوسکیان لەباربچن لەشوێنی بەرز خۆیان فڕێ دەدەن ئەوەبەئەنقەست یاخود بەهۆی بەرزکردنەوەی قورسایی ئەوەش دەبێ خۆیانی لێ بپارێزن٠ژنێك لەباربردنی کۆرپەلەکەی دەگەڕێنێتەوە بۆهەژاری ، دەڵێ : کۆر پەلەدوومانگییەکەم لەباربرد ، چونکە دەمزانی بۆم بەخێوناکرێت٠**

**لەبارچوون :**

**بێ دەستی هیچ کەسێك ڕوودەدات٠**

**لەباربردن :**

**خۆویستەوبەدەستی کەسێك ئەنجام دەدرێ ، ئەمەش دووجۆرە : پێش گیان لەبەراکردن ، د وای گیان لەبەراکردن ، پاش گیان لەبەراکردن کوشتنی نەفسێکی بێ تاوانە ئەگەرمەترسی جددی لەسەرتەندروستی دایکەکەنەبوو ، بەلاّم ئەگەرمەترسی جددی لەسەرتەندروستی دا یکەکەهەبوو بەرژەوەندی مانەوەی دایکەکەلەپێشترە لەکۆرپەلەکە ، چونکە ئەگەردووبەرژە وەندی کەوتنە بەرامبەریەکتری بەرژەوەندی یە گەورەکە زیاترحیسابی بۆدەکرێ٠پێش گیا ن لەبەراکردنیش گوناهە٠**

**حەوتەم – ناوبانگ :**

**حەزکردن لەناوبانگ یەکێکەلەوسیفەتەخراپانەی مرۆڤ زۆرجاردەبینین کەسانێك بەمەبە ستی بەدەستهێنانی ناوبانگ ناوبانگ هانی کەسانێکی داوە هەندێك کارئەنجام بدات کەمە ترسی زۆری تێدابووە بۆسەرژیانیان ، کەسانێك هەبوونە بۆچوونە ناوکتێبی گینسەوە چە ندساڵ خۆیان نەشووشتووە یاخود قژونینۆکیان چاك نەکردووە٠(چ) دەڵێ : هەرکاتێك مر ۆڤ بەرپرسیاریەتیەك وەردەگرێ ودەکەوێتە بەرزوومی کامیرای ڕۆژنامەنووس ومیدیاکاران**

**چێژوەردەگرێ ، بەلاّم ناوبانگ کۆمەلێك شتی گرینگ لەمرۆڤ دەسەنێتەوە وەك لەدەستدا نی بەشێك لەئازادییەکان لەڕووی ڕەفتاروچوونەدەرەوەوپۆشینی جل وبەرگ٠(ئە) دەلێ : کەسانی بەناوبانگ دەبێ حیساب بۆهەرپیتێك بکەن کەلەدەمیان دەردەچێت ، چونکە هە رلەجل وبەرگ وشێوازی ڕۆیشتن وقسەکردن وهەلسووکەوتیان هەرهەمووی لەژێرچاودێر ی دایە٠**

(من لبس ثوب شهرة ألبسه الله ثوب المذلة يوم القيامة) رواه أحمد وأبوداود وابن ما

**جە٠واتا : (هەرکەسێ پۆشاکێك بپۆشێ مەبەستەکەی ناوبانگ دەرکردن بێ ، خوای گەورە لەڕۆژی قیامەت دا پۆشاکی سووکی وڕیسوایی لەبەردەکات)٠پۆشاکی دڕاووپینەکراویش ئە گەرمەبەستەکەی ئەوەبێ خاوەنەکەی بەزاهیدبناسرێ ئەمەش پۆشاکی ناوبانگ دەرکردنە هەروەك "ئیبن جوزی" دەلێت : ((صۆفییەکانی زەمەنی ئێمەپۆشاکێ دەهێنن وپارچەپار چەی دەکەن ودەیدوورنەوە پۆشینی ئەم پۆشاکانە بەلای خەلکێکی زۆرەوە لەئاوریشم بە ناوبانگترە ، چونکەخاوەنەکەی بە (زاهید) بەناوبانگ دەبێ٠))**

**هەشتەم — ئیرەیی (حەسودی) :**

**(د) ئاماژەبەوەدەکات ، کەئیرەیی لەناوکچان دا دەگاتەئەوڕاددەیەی کەداخوازی تێکبدەن ، ئە م کچە دەلێت : کاتێ خوازبینیم هات لەهاوڕێیەکی نزیکی منی پرسی بوو بوختانی بۆهە لبەستبووم چ سوودی بۆئەوهەبوو ؟ ئەمە دەگەڕێتەوە بۆئیرەیی ، کوڕەکە قسەکانی تۆمار کردبوو منیش هەزارقسەم پێووت کەچی هەرئینکاری دەکرد ، بەلاّم من بەخۆم هەمووم گوێ لێبوو٠(ل) قوتابی کۆلیژە کوڕێك لەدەرەوەی کۆلیژهاتبووە داوای برادەرەهەرەنزیکە کەی وتبووی : من شکم لەوکچەهەیە وپەیوەندی لەگەلْ کوڕێك هەیە ، لەبەرئەوەکوڕەکە نەدەهاتەخوازبینیم ، بەلاّم دواترلەکەسانی دیکەی پرسیبوو پەشیمان بووبووەوە٠**

**نۆیەم – گومان یان دڵپیسی :**

{یاأیهاالذین امنوا اجتنبوا کثیرامن الظن ان بعض الظن اثم ولاتجسسوا} الحجرات:١٢

**خوای گەورە لەم ئایەتەدا داوامان لێ دەکات خۆمان لەگومانی خراپ بپارێزین ، کەواتە نا بێت تاشتێك بەبەڵگە لەسەرکەسێك ساغ نەبێتەوە نابێت تۆمەتباربکرێت٠لەشاری کەرکوك دووهاوڵاتی دراوسێی یەکترلەسەرقازێك دەبێتە شەڕیان ودوانزە فیشەك بەرمێرد منداڵێك دەکەوێت وهەرئەوکاتە گیان لەدەست دەدات٠لەبارەی چوونییەتی ئەنجامدانی شەڕەکە : شە ڕەکەلەسەربزربوونی قازێك بووە ، قازەکە ناگەڕێتەوە ماڵەوەیان گومان لەماڵی دراوسێکەیا ن دەکەن کەئەوماڵە قازەکەیان بردووە دەبێتەشەڕیان وشەڕدروست دەبێت ، دواتریەکێکیان بەکلاشینکۆف تەقە لەماڵی (  ) دەکات وشەڕەتەقەلەنێوان هەردوولا دروست دەبێ لەئەنجا مدا چوارگولله بەرمێرد منداڵێکی پانزە ساڵان دەکەوێ ویەکسەرلەشوێنی ڕووداوەکە گیان لەدەست دەدات٠**

**دڵپیسی بەدەردێکی دەروونی وکۆمەلأیەتی دادەنرێت ، کەژیان لەخۆیان وهاوژینەکانیان تاڵ دەکەن٠پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) بەپیاوێکی فەرموو: ((ئەی فلاَن کەس چیتان بو وە ؟ ئەویش وتی : ئەی نێردراوی خوا لەکوڕ یان لەکچ بەولاوە چی لەئێمەدا ئەبێت ؟ درو دی خوای لەسەربێ فەرمووی : ئەی لەکێ ئەچیت ؟ دەڵێ : لەباوك ودایکی بەولاوە لەکێ ئە چیت ؟ درودی خوای لەسەربێ فەرمووی : وامەڵێ ، چونکە کاتێ تۆوی پیاولەڕەحمی ئافرە ت دا جێگیردەبێت هەرچی سیفەتی باب وباپیری هەیە هەمووی تێدا کۆدەبنەوە))٠هەروەها درودی خوای لەسەربێ بەپیاوێکی فەرمووە کەوتوویەتی ژنەکەم منداڵێکی ڕەشی بووە ئەو یش فەرمووی : لە (پشت)ەوە ئەوڕەشییەی بۆهاتبێ٠**

**دەیەم – قومار :**

{انما یرید الشیطان أن یوقع بینکم العداوة والبغضاء في الخمر والمیسرویصدکم عن ذکرالله وعن الصلوة فهل أنتم منتهون} **واتا : (بەڕاستی شەیتان ئەیەوێت بەئارەق خوا ردنەوەوقوماردوژمنایەتی وڕق وکینە بخاتە نێوانتانەوە ولەیادی خواونوێژکردن وەرتان**

**گێڕێت ئایائێوه وازتان هێناوه)٠**

**قومارگەورەترین کارەساتە تووشی تاك وكۆمەلگا دەبێت زۆرلەقومارچییەكان كاتێك سەر مایەیان بەدەستەوە نامینێت گرەولەسەرکچ وژنەكانیان دەكەن ! زۆرقومارچی هەبووە لە سەرەتاداخاوەن سەروەت وسامانێكی زۆربووە بەهۆی قومارکردنەوەهاتۆتە سەرساجی عەلی٠ لەشاری (     ) پیاوێك پاش دوای دۆڕاندنی سەروەت وسامانەكەی قومارلەسەرژنەكەی دەكا ت وپاش دۆڕاندنی ژنەكەی دووپیاودەچنە ماڵیان ، ژنەكەش لەنیوەشەودا منداڵەكەی دەخا تەبن باڵی وبەهاوارکردن وگریانەوە هەڵدێت٠(ئە) بەهۆی قومارەوە ماڵ وئۆتۆمبیلەكەی د ۆڕاند و سەدهەزاردۆلاریش قەرزاربوو دواجار توانای نەما كرێی خانووبدات و بژێوی ژیانی خۆی دابین بكات وبڕیاری خۆكوشتنی دا ، بەلاّم ئەجەلی نەهات ونەمرد٠(ت) هاوسەری پیا وێكی قومارچییە ، دەڵێ : شەوانە مێردەكەم تاسەعات دووی شەو ناگەڕێتەوە ماڵ جگەلەوە ی هەمووناوماڵی دۆڕاندووە قەرزاریشە٠**

**یانزه :**

**پێخەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ، فەرموویەتی :** (اذا استجنح الليل ٠٠٠٠ وأغلق با بك واذكر اسم الله ، وأطفىء مصباحك واذكراسم الله ٠٠٠٠الى اخرالديث) متفق عليه٠ **واتا : (كەشەوداهات ٠٠٠دەرگات دابخەو ناوی خوابێنە ، وە چراكەت بكوژێنەوەونا وی خوابێنە ٠٠٠تاكۆتایی فەرموودەكە)٠**

**شەوان لەكاتی نوستن پێویستە سۆپاكەت بكوژێنییەوە٠لەناحیەی (ڕزگاری) سەربەقەزای خەبات بەهۆی غازی سۆپاوە دایكێك ودووكوڕگیانیان لەدەست دا٠(م) كەدراوسێیەكی ماڵی (ه)ە ، دەڵێ : هاوسەرەكەم پێی وتم ماڵی (ه) ماوەی (٣) سێ ڕۆژەنایەنەدەرەوە بۆیەگوما نیان هەبووە بۆچی ژن ومنداڵەكانی ماڵی (ه) لەوماوەیەلەكۆلاّن نەبینراون ؟ ئەوەبووهەر هەمان ڕۆژئێمەكۆمەڵێك دراوسێی ماڵەكە چووینە بەردەرگای ماڵی (ه) ، بەلاّم دەرگاكە لە پشتەوەداخرابوو لەكاتەدایەكسەربینیمان (ه) كەپێشمەرگەبوولەدەوام گەڕایەوە ئێمەش لە مەسەلەكەئاگادارمان كردەوە ، كەماوەی (٣)سێ ڕۆژە ژن و منداڵەكانی نەهاتوونەتەدەرەوە بۆیە(ه) ی خاوەن ماڵ بەقسەیەی ئێمە حەپەسا٠دوای ئەوەی دەرگای حەوشە و ژووری نو**

ستنی ماڵەکەمان شکاند چووینەژوورەوە بینیمان ژنی ماڵەکە و هەردوومنداڵەکەی کە یە کێکیان تەمەنی سێ ساڵەوئەوی دیکەیان تەمەنی دووساڵە لەنێوپێخەفەکانیان خنکاون بە هۆی غازی سۆپاوە٠کاتێك تەماشای سۆپاکەشمان کرد نەوتی تێدانەمابوو فتیلەکەشی هەمو وی سوتابوو بۆیەهۆکاری خنکانەکە : لەکاتی نوستن لەشەودا دایکی منداڵەکان لەشەودا سۆ پاکەی نەکوژاندبووەوە وهیچ یەك لەوسێ خنکاوانەش لەشوێنی خۆیان نەجوولابوون ، چو نکەدوای هەڵچوونی سۆپاکە گازی دوانائۆکسیدی کاربۆن باڵی کێشاوەبەسەرژوورەکەیان داو ئۆکسجینیان بۆنەچووە لەئەنجام داخنکاون٠

دوانزە :

(٠٠٠ومن كان يؤمن بالله واليوم الأخر فلا يدخل حليلته الحمام)٠

واتا : (ئەوەی بڕوای بەخواوبەڕۆژی دوایی هەیە باخێزانەکەی ئیزن نەدات بۆحەمام(حەما می بازاڕ)٠هاووێنەی ئەمە ژووری پێوانەکردنی جل وبەرگ لەفرۆشگاکانی پۆشاکی ژنان٠ یەك لەوکارە نەشیاوانەی دەتوانرێت بەهۆی کامیراوە ئەنجام بدرێت ، کەکامیراهەیەبەئەندا زەی دەنکە نیسکێکە لەهەرشوێنێك کەسەکە بیەوێت دەیشارێتەوە ، ئەویش دانانییەتی لە شوێنی خۆگۆڕینی ژنان لەنێوفرۆشگاکانی پۆشاکی ژنان هەمووی نا ، بەلاَم هەندێکیان ڕە نگەکامیرایان لەشوێنی خۆگۆڕینی ژنان دانابێ ڕەنگە خاوەن دوکانەکان سەیری بکەنەوە کە دەتوانرێ بەسەقفی شوێنی خۆگۆڕینەکان دابنرێ٠

سیانزە - دەمەقالێ :

دەمەقالێ هەمیشە سەرچاوەی شەڕوناکۆکی یە٠پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموو یەتی : ((أنازعيم ببيت في ربض الجنة لمن ترك المراء وان كان محقا))٠واتا : ((من کەفیلم بەماڵێك لەبەهەشت بۆکەسێك وازلەدەمەقالێ ومشت ومڕ بهێنێت ، ئەگەرلەسەرحە قیش بێت))٠زۆربەی شەڕوبەگژداچوونەوەکان ، کە دەبێتە هۆی دەردەسەرییەکی زۆروهەر چی بکەن وەك خۆی لێ نایەتەوە لەسەرشتی زۆربچووك وهیچ وپوچ لێیان دەبێتە شەڕونا خۆشی لەسەردەمەقالێیەك ئافرەت خۆی دەسووتێنێت وچەقۆلێك دەکێشن ودەمانچە لێك هەڵدەکێشن لەنموونەی ئەوشتانەی لەسەری بەشەڕدێن :

لەبازاڕی شاری (ڕانیه) بەهۆی دەمەقالێ لەسەروەستانی ئۆتۆمبێل لەبەردەم دوکانێکی کوتا
ڵفرۆشی کوڕێکی نۆزده سالأن دەکوژرێت وباوکەکەشی بریندارده‌کرێت٠(ع) که خاوەن ئۆتۆ
مبیلی تەکسییه سەیارەکەی لەبەردەم دوکانی کوتاڵفرۆش (خ) ڕادەگرێ ، خاوەن دوکانەکه
ش پێی دەڵێ : ئەم ئۆتۆمبیله لێره لابه کەل وپەل دادەگرین بەوهۆیەوه دەبێتەدەمەقالێی
نێوان (خ)و(ع) دواتریش خاوەن ئۆتۆمبیلەکه دەچێ کلانشینکۆف دەهێنێت وتەقەلەدوکاند
ارەکەوکوڕەکەی دەکات لەئەنجام دا خاوەن دوکانەکه بریندارده‌کات وکوڕەکەشی دەکوژێ٠له
شاری(دهۆك)یش لەسەربەرکەوتنی چەندپڕوشکەئاوێك دەبێتەدەمەقالێ لەئەنجامدایەکێك
دەکوژرێت ودووکەسیش بریندارده‌بن ئەمەش لەکاتێکدا ڕوویدا کەیەکێك لەخاوەن پیشانگا
کان خەریکی شوشتنی بەردەرگای پیشانگاکەی خۆی بووه لەوکاتەدایەکێ بەوناوەدا ڕەت بو
وه چەندپڕوشکەئاوێکی بەردەکەوێ لەسەرئەوەدەبێتەدەمەقالێی نێوانیان دواتریش کەوتنه
تەقەکردن لەیەکتری تالەئەنجام دا یەکێك دەکوژرێت ودووکەسیش بریندارده‌بن٠ڕووداوێکی
ترلەناحیەی (   ) سەربەشاری هەولێر لەسەرکۆترێك دوومالّه دراوسێ دەبێته شەڕودەمەقا
لێیان به(١١)کەس ، بەعائیلەکی کامل هێرش دەکەنه سەردراوسێکەی خۆیان وبەخاکەناس و
بەردوداربریندداری دەکەن ودوای نیوکاتژمێریش لەگەیاندنی بۆنەخۆشخانه گیان لەدەست د
ەدات٠لەبارەی چۆنییەتی ئەنجامدانی شەڕەکه : کۆترێك هاتۆته سەرماڵی (أ) ئەوماڵەش به
ردیان لەماڵەکەی (أ) گرتووه بەردێکیش بەجامی سەیارەکەی (أ)کەوتووه ، (أ)یش کۆترەکه
ی هەڵفڕاندووه لەسەرئەوه دەبێته دەمەقالێیان ولەدوای بانگی ڕۆژووشکاندن بەکۆمەڵ هه
رهەموویان بەچەقۆ ، خاکەناس ، بەردودار ، بەژن وبەپیاو ، بەگچکەوگەوره هێرشیان کرد
ۆتەسەرماڵی (أ) وتاڕایانکێشاوەته بەردەرگا لێیان داوه ، کەبه (١١)کەس لەتاقەکەسێکیان دا
وه دووکەسی دیکەش کەناوبژیوانییان کردووه ئەوانیش بریندداربوون٠

**چوارده — خۆهەلقورتاندن لەئیشی خەڵك :**

((من حسن اسلام المرء تركه مالايعنيه))رواه الترمذي وابن ماجة **واتا : ((لەنیشانەکا
نی ڕەوشتی جوانی موسوڵمان ئەوەیه خۆی لەشتێك هەڵنەقورتێنێ ، کەپەیوەندی بەوەوه
نییه))٠**

**هیچ شتێك ئەوەندی پرسیارکردن لەوردەکارییەکانی ژیانی خەڵکی بێزارکەرنییە٠(س) دە ڵێ : ئەوکەسانەی پرسیارم لیّ دەکەن تەمەنت چەندە ؟ من وادەزانم مەبەستیان زانینی تە مەنم نییە مەبەستیان هەست برینداركردنمە ، تەمەن پرسیارکردن دیاردەیەکە لەکوردەوار یدا هەیە٠بەتایبەتی ئەوکچانەی نەچوونەتە ناوپڕۆسەی هاوسەرگیری حەزناکەن تەمەنی خۆیان بەخەڵك بڵێن لەڕوانگەی سایکۆلۆجییەوە شتێکی باش نییە پرسیارکردن لەوردەکار ییەکانی ژیانی خەڵك٠(ب) دەڵیّ : خۆهەلقورتاندن نەریتێکە لای ئێمە لەژیانی ڕۆژانەماندا بۆتەکارێکی ئاسایی بۆنموونە کاتێك کەسێك هاوسەرگیری دەکات دەڵیّ خزمە یان بێگانەیە؟ ئەگەربێگانەبوو دەڵیّ : بۆخزمت نەهێنا ؟ ئەگەرخزم بوو دەڵیّ : بێگانە باشترە٠ئایاچەندز ێرت بۆکرپیوە ؟**

**پانزە : - ڕقلێبوونەوە :**

**پێخەمبەر (درودی خوای لەسەربیّ) فەرموویەتی :** ((اياكم والظن فاءن الظن أكذب الحد يث ، ولاتحسسوا ، ولاتجسسوا ، ولاتنافسوا ، ولاتحاسدوا ، ولاتناجشوا ، ولاتباغضو ا ، ولاتدابروا ، ولاييع بعضكم على بعض ، ولايخطب الرجل على خطبة أخيه حتى ينكح أويترك ، وكونوا عبادالله اخوانا ، المسلم أخوا المسلم ، لايظلمه ، ولايسلمه ، و لا يخونه ولا يكذبه ، ولا يخذله ، ولا يحقره ومن كان في حاجة أخيه كان الله في حا جته ، ومن فرج عن مسلم كربة فرج الله عنه كربة يوم القيامة ، التقوى هاهنا ويشير الى صدره ثلاث مرات ، بحسب امرىء من الشر أن يحقرأخاه المسلم ، كل المسلم على المسلم حرام : دمه وماله وعرضه))٠

**واتا : (( ئامان وریای گومان بن ، چونکە گومان درۆترین وتەی دەروونە وەجاسووسی مە کەن ، مونافەسەی یەکتری مەکەن بۆدنیا ، حەسودی بەیەکتری مەبەن ونرخی شت ومەك لەسەریەکترگران مەکەن ، ڕقتان لەیەکترنەبیّ ، پشت لەیەکترمەکەن ، وەمامەڵەی کڕین و فرۆشتن مەکەن بەسەرمامەڵەی یەکتر ، وەخوازبینی ژن مەکەن بەسەرخوازبینی براتان ، تاوەکوئەومارەی دەکات یان وازدێنێت ، وەببن بەبەندەی خواوبرای یەکتر ، موسوڵمان برای موسوڵمانە ، زوڵم وستەمی لیّ ناکات ، خیانەتی لیّ ناکات وبەدرۆشی ناخاتەوە ، دەست بەسە ری ناکات وسەرشۆڕی ناکات ، وەبەچاوی سووك تەماشای ناکات ، هەرکەسێك لەپێویستی بر ای موسوڵمانی دابێت ئەواخوالەپێویستی دا دەبێت ، هەرکەسێك نارەحەتییەك لەسەرموسو**

**ڵمانێك لابەرێت خوا نارەحەتییەك لەنارەحەتییەكانی قیامەتی لەسەرلادەبات ، وە هەركە سێك عەیب وكەم وكوڕی موسوڵمانێك داپۆشێت ئەواخواعەیب وكەم وكوڕی دادەپۆشێت لە لەقیامەت دا ، لەخواترسان ئالێرەیە ، سێ جار ئاماژەی كرد بۆسینگی ، بەسە بۆخراپێتی موسوڵمان كەبەچاوی سووك سەیری برای موسوڵمانی بكات ، هەمووموسوڵمانێك خوێن و ماڵ وناموسی حەرامە لەسەرموسوڵمان))٠**

**مەبەست لەگومان بریتی یە لەتۆمەتباركردنی كەسێك بێ ئەوەی شتێكی پێوە دیاربێت ، بێ بەڵگە٠**

**تحسسوا : بریتی یە لە گوێگرتن بۆ قسەوباسی نێوان خەڵك لەگەڵ تجسسوا بەخاڵ وبێ خا ڵ هەردووكیان یەك واتایان هەیە ، بەڵام تحسسوا گشتگیرتروفراوانترە ، كەیەكێكە لە پێنج ئەندامەكانی هەست كەبەچاووگوێ هەستیان پێ دەكرێت ، بەڵام تجسسوا بریتی یە لەگەڕا ن بەدوای شتێك لەپێناوی كەسێكی تردا٠بەڵام جاسوسی بۆنموونە كەسێك كەسێكی بردووە بۆچۆڵەوانی بۆئەوەی بیكوژێت یان كەسێكی ڕفاندووە لەم حاڵەتەدا جاسوسی دروستە٠**

**غەیبەت ئەوەیە كەباسی مرۆڤ بكەی بەخراپە لەكاتێكدا ئەونادیارە وئامادەنییە٠بنچینەی وشەكە لە (الغیبە) وە هاتووە واتا نادیاری٠**

**حەسودی : بریتی یە لەوەی كەوا مرۆڤ پێی ناخۆشبێت كەوا خوای تەعالا نازونیعمەتێكی داوە بەكەسێك لەڕووی پارەوماڵ وزانست ومنداڵ خۆزگەی نەمان ولەناوچوونی بخوازێت٠**

**النجش : بریتی یە لەزیادكردنی نرخی شت ومەك لەسەریەكتر بەبێ مەبەستی كڕین بۆ ئەوەی كەسێكی ترجگە لەخۆی بكەوێتە ناوئەوزیادەدانەوە یان مەبەستی سوودگەیاندن بەفرۆشیارە بەزیادكردنی نرخی شتەكەبۆی٠**

**ولاتدابروا : واتاپشت لەیەكتری مەكەن ، لەڕووكردنی پشتی كەسێك لەكەسێكی تر وەرگیرا وە ئەگەرڕووی تێ نەكات وڕووی لەلای نەبێت ، چونكە ئەوكەسەی ڕق وقینی لەدڵ دایە یان بەچاوی كەم سەیری كەسێك دەكات بەرامبەربەكەسێك ڕووی تێ ناكات بۆنموونە دوو كەس بەیەك دەگەن ، بەڵام ئەوڕووناكاتە كەسەكە یان كەسێك بەبەردەرگای دادێ لەولەحز ەی دەچێتە ژوورەوە٠**

(ولايبع بعضكم على بيع بعض) **مەبەست ئەوەیە كەوا كڕیار شت ومەكێك پەسند دەكات**

هەردووكیان دەكەونە ناوباسی نرخەكەوە تەنهائەوەمابێ مامەڵەكە دابمەزرێ یەكێك پێی بڵێ لای من لەوەباشترهەیە مامەڵەكەیان هەڵبوەشێنێتەوە٠هەروەهاكڕینیش لەسەركڕینی یەكترحەرامە ، كەكڕیارشتێكی كڕیوە بڵێ ئەم مامەڵەیە هەڵبوەشێنەوە من بەنرخێكی هەر زانترپێت دەفرۆشم یان بەفرۆشیاربڵێ مامەڵەكە هەڵبوەشێنەوە من بەنرخێكی گرانترلێت دەكڕم٠

مرۆڤ دەبێ ئەوهۆكارانە بگرێتەبەر كەخۆشەویستی بەرهەم دێنن ، وەكو درودی خوای لە سەربێ فەرموویەتی : ((تهادوا تحابوا)) یان فەرموویەتی : ((لاتدخلون الجنة حتى تؤمنوا ، ولاتؤمنوا حتى تحابوا أولا أدلكم على شىء اذا فعلتموه تحاببتم:أفشوا السلام بينكم)) رواه مسلم٠(م) دەڵێ : دیاری شتێكی زۆرجوانە ، چونكەهەرجارێك ئەودیاری یە دەبینیت ئەوكەسەوئەوكاتەت دەكەوێتەوەیاد هەمووبیستنێكی ئەوكاتانەت بەبیردێتەوە٠

(ئا) دەڵێ : من زۆررقم لەوكەسانە دەبێتەوە كە درۆدەكەن ، چونكە كەسی درۆزن هەمیشە كەسێكی ناشیرینە لەناوكۆمەڵگەو ئەم جۆرە كەسانە زەرەروزیانیان بۆخۆیان ودەوروبەرەكە یان هەیە٠

(ش) دەڵێ : من ڕقم لەوكەسانە دەبێتەوە كە ڕاستگۆنین بەتایبەتی لەژیانی هاو سەری دا٠

(ڕ) دەڵێ : من ڕقم لەوكەسانە دەبێتەوە ، كەژیان لەخەڵك تێكدەدەن٠

لەبارەی هاوسەرگیری وژیانی خێزانی :

(د٠فریدریك كهن) ، دەڵێ : ((خەڵكی لەڕابردوودا زووژنیان دەهێنا ئەمەش چارەیەكی دروست بوو بۆكێشەی جنسی ، بەلاَم ئەمڕۆهاوسەرگیری دوادەكەوێت))٠

دووبیرمەند بەناوەكانی (هاجین)و(ماكس كریستیان) بەلێكۆڵینەوە گەیشتوونەتە ئەوەدە رەنجامەی كەكوڕان لەتەمەنی (٢٥) ساڵی ژن بهێنن وكچانیش كەمترلەوتەمەنە شووبكەن توێژینەوەكان سەلماندوویانە كەجەستە لە تەمەنی (٢٥) ساڵی دا دەگاتە قۆناغی كۆتایی پێگەیشتن٠

(ئا) دەڵێ : زووپێكهێنانی خێزان بەڕای من چاكترین شتە بۆئەوەی كۆمەڵگاوتاك دووربن لەنەخۆشی ونەهامەتی لەبەرئەوەی كۆمەڵ لەبەدڕەوشتی وبێسەروبەری دووردەخاتەوە٠

(پ) لەبارەی هەڵبژاردنی هاوسەروئەوسیفاتانەی ، كەپیویستە تێیدابێت ، دەڵێت : پەیوە

ستبوونی کچەکەبەئاین ونزیکی تەمەن وهەبوونی بڕوانامە٠(ب) دەڵێ : ئارەزوودەکەم کە سێکی پاك وخاوێن بێت ولێبوردەبێت٠(چ) دەڵێ : ڕوخسارگرینگ نییە بەلامەوە گرینگ شەخسیەت وتەبیعەت وگونجان لەنێوانمان دا ، هەروەهامن ئەوسیفاتانەی وتم لەمێردەکەم بەدی دەکەم٠(ل) کچێکە دەڵێ : ئاساییە پیاویارمەتی ژنەکەی بدات بەس نەیکاتەپیشە بە پێی پێویست زۆرجارئافرەت فریای ئیش وکارناکەوێ بەهۆی میوانداری یان منداڵەوە٠(ن) یش کچێکی دیکەیە دەڵێ : من کەسێك هەڵدەبژێرم ، کەڕەگی پیاوەتی تێدابێت واتاژنانی نەبێت یارمەتی ئەوم ناوێت خۆم کاری خۆم دەکەم٠کەواتەزۆرجاژنانیش پێیان قبول نییە پیاوئیشی ئافرەت بکات٠لەبارەی جیاوازی نێوان گوندوشارلەپڕۆسەی هاوسەرگیری (س) دە لێ : لەلادێ ژنهێنان ئەرکی کەمترە ، چونکە کێشەی کرێی خانوومۆدیلات نییە٠(ق) دەڵێ : خەڵکی لادێ داوای شتی زۆرلەزاواناکەن لەبەرئەوە ژنهێنان لەلادێ زۆرترە وەك لەشار٠
(ل) کچێکە دەڵێ : من کۆمەڵێك مەرجم بۆشوکردن هەیە ، یەکەم دەبێ خوێندنەکەم تەوا وبکەم ، دووەم دەبێ بڕوانامەی هەبێ وفەرمانبەرێکی باشیش بێ٠(ك) دەڵێ : بۆچارەسەری هەندێك لەکێشەکانی خێزان خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا چەندین هەنگاوی داناوە بۆئە وەی پێش تەلاق پەیڕەوبکرێت تاوەکونەگاتە تەلاق بۆئەوەی پەلەنەکرێ ، چونکەزۆرجاران پەشیمان دەبنەوە ، هەنگاوی یەکەم ئامۆژگاری کردن ، هەنگاوی دووەم لەناوجێگالێیان جیا ببنەوە ولەگەڵیان جووت نەبن ، هەنگاوی سێیەم کەلێدانە بۆمەبەستی چاککردن ، هەنگاو ی چوارەم سولح وڕێککەوتن ، هەنگاوی پێنجەم ناوبژیوان (التحکیم) لەوکاتەی کەناکۆکی لە نێوان ژن ومێرد دروست دەبێ پێویستەناوبژیوانێك هەبێ یارمەتییان بدات کێشەکان چارە سەربکات ، ئەگەرهیچ لەوهەنگاوانە سەری نەگرت هەنگاوی شەشەم تەلاقدانە ، هەروەهادە لێ : ئەگەرپیاوهەرناچاربووشەی تەلاق بەکاربێنێ بابەیەك تەلاق خێزانەکەی تەلاق بدات ، کەپێی دەوترێ تەلاقی ڕەجعی٠(م)دەڵێ: ئەگەرخێزانەکەم خواستی لەسەرشتێك نەبێ هە رگیزگوێ بەقسەکانی من نادات زۆرجاریش ئەوەندە بەتوندی بەسەرم دا ڤیژاندوویەتی هە تادراوسێکەمان هەستی پێکردووە٠(ڕ) دەڵێ : لەوخێزانانەی کەژنەکان ڕێزی پیاوەکانیان نا گرن ، منداڵەکانیش هیچ ڕێزێك بۆ بڕیارەکانی باوکیان دانانێن٠ (ن) دەڵێ : لەوەتەی ژنم هێناوە فۆڕمات بوومە ، دەڵێ لەدوای هاوسەرگیری یەوە وازم لەگەڕان وچوونەدەرەوەی زۆر

هێناوه٠(د)کچێکه ، دەڵێ : پیاوبەکارکردن لەدەرەوە جوانەوژنیش بەکاری ناوماڵ٠دەڵێ :
پیاوێکی جیرانمان هەیە بەخۆی لەماڵەوەقاپ دەشوات وجل وبەرگی منداڵان دەشوات ژنەکە
ش لەبەرامبەری دادەنیشێت قاچەکانی دەخاتە سەریەکتربەڕاستی دیمەنێکی ناشیرینە٠(ئە)
دەڵێ : ئاساییەئەگەرلەکاتی نەخۆش کەوتنی ئافرەت پیاوەکەی لەماڵەوەیارمەتی بدات ، بە
لام وەکی دی نا٠(ف) دەڵێ : شتێکی باشەئەگەرپیاولەهەندێ شت هاوکاری خێزانەکەی بکات
، بەڵام نەوەك لەهەمووکارێك٠(م) دەڵێ : ئێستائەوژنانەی داوای تەڤریق وجیابوونەوەدەکە
ن ژمارەیان زیاترەلەوپیاوانەی کەژنەکانیان تەلاق دەدەن بەجۆرێك بەشی زۆری جیابوونەو
ەلەلایەن ژنانەوەیە٠(د ه) دەڵێ : هۆکارەکانی جیابوونەوە :-

یەکەم : نەگونجان لەگەڵ یەکتری٠

دووەم : هۆکاری ئابووری ونەبوونی ماڵی جیا٠

سێیەم : خیانەتی هاوسەری٠

چوارەم : ئینتەرنێت وتەکنەلۆژیای سەردەم٠

پێنجەم : نەخۆشی ونەزۆکی٠

شەشەم : هێنانی ژنی دووەم٠

(ی) نابینایەکە بۆجوانی وناشیرینی ڕوخساری کەسێك دەنگی دەکاتەپێوەر ، ئەگەرکەسەکە
دەنگی خۆش وناسك بوو پێیوایە ئەوەکەسێکی جوانە ، بەڵام ئەگەردەنگی گڕوناخۆش بوو
ئەوەپێیوایەکەسێکی ناشیرینە٠(یا) نابینایەکی ترە ، دەڵێ : ئێمەی نابینابەهیچ شێوەیەك
لەگەڵ ئەوەدانین هاوسەرگیری لەگەڵ کەسێکی دیکەی نابینابکەین ، چونکە ناتوانێت یارمە
تیمان بدات٠بەڵام ئەگەرکەسێکی نابیناهاوسەرگیری لەگەڵ کەسێکی چاوساغ کرد چاوساغە
کەدەتوانێت یارمەتی کەسەنابیناکەبدات٠(د٠ع) دەڵێ : شووکردنی کچ لەتەمەنی بچووك دا
خراپە ، چونکە هیچ تێگەیشتنێکی بۆژیان نییە ، هەروەها خوێندنی لەدەست دەچێت٠هەر
وەهادەڵێ : مێردکردن لەدوای تەمەنی (٣٥)ساڵی کێشەی هەیە ، چونکە لەدوای (٣٥) ساڵی
کێشەی منداڵ نەبوونیان بۆدروست دەبێت٠(چونکەهێلکەدانیان لاوازدەبێ)٠(ح) دەڵێ : بە
هیچ شێوەیەك بەسێ تەلاق ژنی تەلاق نەدەن ، چونکە ئەوژن ومێردانەی لێکجیابوونەتە
وە زۆرجاردەشێت دوای چەندمانگێك یان چەندساڵێك پەشیمان ببنەوە بەتایبەتی ئەوژن و

مێردانەی خاوەن منداڵن ، چونکەئەگەرژنەکە بەیەك تەلاق تەلاق درابێ ئەوامێردەکەی دە توانێ دووبارەلەخۆی مارەبکاتەوە٠(ش) دەڵێ : لەنێوان زۆرلەولاش زاواکان ناکۆکی وشەڕی ساردهەیە ، چونکەهەندێکیان پێیان خۆشەماستاووپانکردنەوە بۆماڵەخەزوورانیان بکەن و دەیانەوێت لای ماڵەخەزوورانیان خۆشەویست بن ، چونکەپێی خۆش نییەولاش زاواکەی لە وخۆشەویست تربێ ئەوفەرامۆش بکرێت٠هەندێکیشیان پەیوەندی توندوتۆڵ وگەرم وگوڕلە نێوانیان دا هەیە وهیچ کێشەوگیروگرفتێك لەنێوانیان دانییە وەکو دووبرامامەڵەلەگەڵ یە کترەدەکەن٠(ن) دەڵێ : من پەیوەندی توندوتۆڵ وگەرم وگوڕم لەگەڵیان داهەیە ، ئەگەرملیار دێریش بن حەسودییان پێنابەم ، چونکە خوانەخواستەئەگەرمن کێشەوگیروگرفتێکم هەبێ ئەوان دێن بەدەممەوە هاوکاریم دەکەن٠(ب) دەڵێ : من کاروکاسبییەکی باشم هەیە دووولا ش زاواکەی ترم لەڕووی مادد ییەوە باش نین من بەهەمووشێوەیەك یارمەتی ماڵی خەزوور م دەدەم هەمیشەبەدەمیانەوەدەچم ناهێڵم پەکیان بکەوێ بۆیە ماڵی خەزوورم زیاترمنیان خۆش دەوێ ، زیاترپرس و ڕاوێژبەمن دەکەن بۆیە ولاش زاواکانم ئەوەیان پێناخۆشە ، بە لاَم من هیچ ڕقم لەوان نییە٠(ز) دەڵێ : بێگومان بڕوانامە کاریگەری ئیجابی دەبێت لەسەر پڕۆسەی زەواج بەتایبەتی لایەنی ئابوری وەرگرتنی دووموچە لەمانگێك دا بۆیەئەوکەسەی هەڵیدەبژێرم بڕوانامەبەیەکێك لەمەرجەکان دادەنێم ، چونکە بڕوانامە کاریگەری هەیە لە سەرشێوازی مامەڵەکردن لەگەڵ یەکتری وهۆکارە بۆنزیکبوونەوەی ئاستی تێگەیشتن لە یە کتری وکاریگەری لەسەرگونجانیان لەگەڵ یەکتری دەبێ ، تاکولەڕووی ڕۆشنبیرییەوەلەیەك ئاست بن یاخودهەرهیچ نەبێ لەیەکتری نزیك بن٠(ش) دەڵێ : هۆکاری سەرنەکەوتنی ژیا نی هاوسەری بەڕای من بۆسێ خاڵ دەگەڕێتەوە بۆ : نەبوونی خۆشەویستی ، نەبوونی ڕێز ، نەبوونی لەیەك گەیشتن٠(ئا) بەم جۆرە هۆیەکانی تەلاق دەبینێت : -

١ — جیاوازی تەمەن

٢ — باری ئابوری

٣ — نەبوونی ڕێزلەنێوانیان دا

٤ — نەبوونی متمانە لەنێوانیان دا

٥ — ڕەزیلی

(ش) دەڵێ : من خەسووم بەدایکی دووەمم دەزانم لەبەرئەوەی توانیویەتی هاوسەرەکەم بە شێوەیەکی ڕێکوپێك گەورە بکات وبتوانێت لەژیانم دا بەختەوەرم بکات هەروەها سوودیشم لێی بینیوە لەبەرئەوەی خێزانەکەم فەرمانبەرە توانیویەتی ئاگای لەمنداڵەکانم بێت وبە خێویان بکات٠(م ع م) دەڵێ : مێرد کارەکەربۆژن بگرێت ، ئەگەرعادەت بوولەماڵی باوکی یا ن بەهۆی پەککەوتەیی٠(د) دەڵێ : خێزانم پێك نەهێناوە لەبەرئەوەی ئەوموچەیەی وەری دەگرم بەشم ناکات لەلایەکی تریش پارەم نییە٠(ش) دەڵێ : هاوسەرم نییە ، چونکە حەزم لەدەرەوەی وڵاتە٠(ف) دەڵێ : خێزانم پێکنەهێناوە لەبەر : نەبوونی پارە ، نەبوونی خانوو٠ (س) دەڵێ : تاکوئێستا هیچ خوازبینییەك نەکراوم لەبەرئەوە بێ هاوسەرماومەتەوە٠(ن) د ەڵێ : لەبەرئەوەی دوودڵم قەلەقم تائێستاش پیاوێکی گونجاونەبووە تاشووی پێ بکەم٠(ب) دەڵێ : خێزانم پێکنەهێناوە لەبەرئەوەی زڕووفم مساعدنەبووە تائێستا٠(ھ) دەڵێ : بیرم لە زەواج نەکردۆتەوە لەبەرئەوەی باری ئابووریم خراپە٠(گ) دەڵێ : حەزم لەتەواوکردنی خو ێندنی بالأیە لەبەرئەوە بیرم لێ نەکردۆتەوە٠(م) پیاوێکی تەمەن (٦٠)ساڵە دوای بەسەربرد نی (٣٧)ساڵ لەژیانی هاوسەری بوونی شەش کوڕوچوارکچ ئێستالەخانەی بەساڵاچووان ژیان بەسەردەبات ئەوپیاوە دەڵێ : لەسەرەتاوە مەجالێکی زۆرم دابووە ژنەکەم مووچەکەم وەردە گرت هەمووم لەدەست ژنەکەم دەکرد دواترئەگەرپێویستم بەپارە هەبووایە لەژنەکەم وەرم دەگرت ئەودڵسافییەی من بووایکرد ئەوهام بەسەربێ دەڵێ منداڵەکانم پێیان دەوتم بەچا ك وبەخراپ تۆنابێ قسەبکەی یەکی شەویش کوڕەکەم بێتەوە پێی نەڵێم لەکوێ بووی ؟! ژنەکەشی لەدادگابەشێت تۆمەتباری کردووە٠(ك) دەڵێ : زۆرجارلەکاتی پرسیارکردن لەکە سێك بۆمەبەستی هاوسەرگیری پرسیارلەکەسێك دەکرێ دەڵێ : دەیناسم ئایامەبەستی مانا ی قووڵی وشەکەیە ؟ ئایا تەنها ناووشوێن وگەڕەکە ؟ لەوانەیەئەم ناسینە تەنهابەدیتنێك بێ ، بەلأم پێوەری ناسین هەرزانینی ناووفۆڕمێك نییە چونکە مرۆڤ قوولە هەرتەنهابینینی و ێنەکەی نییە ، هەروەها هەرکەس بەنیگای خۆی لەکەسەکان دەڕوانی٠(  ) دەڵێ : ئەگەرکوڕ کچی خۆشبوێت دەبێ بچێتە داخوازی ئەگەرنا بۆکات بەسەربردنە ئەمەش لەهیچ ئاینێکدا قبوول نییە٠زۆرجاریش لەمیانەی پەیوەندی کچ  و کوڕدا جنس لەنێوانیان دا ڕوودەدات ئە مەش دیسان لەهیچ ئاینێکدا قبول نییە لەئاینیش دا  لەسەرمەسەلەی کچ  و کوڕی زیناکار

هەردووکیان سزادەدرێن٠(ك)دەڵێ : دەتوانین بڵێین دایك بەرامبەربەمنداڵەکانی لەباوك بە زەیی ترە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کەخوای گەورە ڕەگەزی مێی بەوجۆرە دروست کرد ووە بۆئەوەی پشوودرێژبێ لەبەخێوکردنی منداڵەکانی زۆرجاردایك بۆ بەرژەوەندی منداڵە کانی دانیشتووەوشووی نەکردۆتەوە ، هەروەهالەصەحیحی بوخاری ومسلم دا هاتووە ، کەدر ودی خوای لەسەربێ فەرموویەتی : ((والله أرحم بعباده من الوالدة بولدها))٠

لەبارەی فرەژنی :

فرەژنی لە ڕووی ئاینییەوە (مباح)ە واتا ڕێپێدراوە ، بەلاّم دادگەری کردن لەنێوان ژنەکان دا کراوەتە مەرج ، مەبەستیش ئەوەنییە هەرچی هەڵسێ وبچێ ژنێکی تربێنێ٠
بێگومان سروشتی ژن وایە ژنی لەپاش نەیێ ، هەروەك منداڵیش حەزدەکات خۆشەویستی دایك وباوکی بەتەنیابۆئەوبی بۆیە ئافرەتیش حەزدەکات ژنی بەسەرنەیێ ، چونکە ئەوژنە دەیەوێت ئەوپیاوەبەتەنیابۆخۆی بێت ، هەروەهاسامان وپارەی پیاوەکەی بەتەنیابۆخۆی بێ تەنانەت حەزناکات پیاوەکەی یارمەتی باوك ودایکیشی بدات بێگومان هیچ دایك وباوکێك پرس بەمنداڵەکەی ناکات ، ئەگەربیانەوێ منداڵی تریان هەبێ٠پێشینەکان دەنکەخورمایە کیشیان نەبووبیخۆن ئەوجاژنیشیان زۆردەینا ، کەواتە مانای ئەوەنییە هەریەکەیان هەموو پێداویستییەکی ژیانی دەرەجەیەکیان هەبێ ، بەلاّم دەبێ بەجیادایان بنێ واتاهەریەکەیان لەماڵی خۆی سەربەخۆبێ تەنیائەگەرئافرەتەکان ڕازی بوون لەگەڵ یەکتربژین ئەوکات لە گەڵ یەکیش بن کێشەنییە٠ئەوپیاوانەی کەموعارەزەی فرەژنی دەکەن (هەموویان نا) لەگە ڵ ئافرەتی ترپەیوەندییان هەیە واتابەخۆشیان بەیەك ژن ئیکتیفاناکەن ، هەروەهاهەندێك پیاوفرەژنییان ناشیرین کردووە ، لەگەڵ یەکیان خراپە لەگەڵ ئەوی ترزۆرزۆرباشە ئەوەش یەك لەئەسبابەکانی ڕەتکردنەوەی فرەژنییە٠

لەبارەی ڕێزگرتن :

کۆمەڵناسێك ، دەڵێ : ((کاریگەری قسەیەکی ناشیرین لەلێدان زیاترە))٠درودی خوای لەسە ربێ ، فەرموویەتی : (کبر کبر) متفق علیه واتا : (گەورە پێش بخە ، گەورە پێش بکەوە)٠

هەروەها فەرموویەتی : (ليس منا من لم يجل كبيرنا ويرحم صغيرنا) واتا : (لەئێمە نییە ئەوەی ڕێزی گەورەکان نەگرێ وبەزەیی بەبچووکمان نەیەتەوە) (گەورەیی لەتەمەن وگەو رەیی لەدەسەلاّتیش)٠

(گ) دەڵێ : دەبێ پشت بەبەساڵاّچووان ببەسترێت وبەچاوی ڕێزەوە لێیان بڕوانین ، چونکە بەساڵاّچووان تەمەنێکی زۆریان بەڕێکردووە وزۆرشت لەبارەی ژیانەوە دەزانن ، تاکوئێستا زۆرلەئێمە وەکوئەوان زانیاریمان نییە لەولاّتانی ڕۆژئاوا زۆرپشت بەکەسی بەساڵاّچوودەدر ێت ئەنجومەنی پیران باشترین نموونەیە٠

## لەبارەی پاشەکەوت کردن :

سەبارەت بەکۆکردنەوەی ماڵ وسامان پەیڕەوی ئەوقسەیەبکەین ، کەدەڵێ : (دراوی سپی بۆ ڕۆژی ڕەش)٠یەعقوب پێخەمبەر(سەلامی خوای لێ بێ) کەکوڕەکانی پێیان وت : ونزدادكيل بعير) يوسف : ٦٥ واتا : (بارەوشترێکیش دانەوێڵەی زیاددەهێنین) ئارەزووی کردوبنیامینی لەگەڵ ناردن٠پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) بەسەعدی فەرموو : (انك أن تذر ورثتك أغنياء خيرمن أن تذرهم عالة يتكففون الناس) واتا : (ئەگەرواریسەکانت بەدەوڵەمەندی بەجێ بهێڵی زۆرچاکترە لەوەی ، کەبەهەژاری بەجێیان بهێڵیت ودەست لەخەڵك پان بکەنە وەودەستکورت بن)٠

## خۆپاراستن :

کارکردن بۆپاراستنی نەفس کارێکی ڕەوایە بۆخۆپاراستن لەمەترسییەکان٠خوای گەورە لە سەرزاری حەزرەتی یەعقوب (سەلامی خوای لێ بێ)دەفەرموێت :{ ولاتقصص رؤياك على اخوتك}يوسف: ٥ واتا : (خەوەکەت مەگێڕەوەبۆبراکانت){لاتدخلوا من باب واحد} يوسف : ٦٧ واتا : (هەمووتان لەدەرگایەکەوە مەچنە ژوورەوە)٠هەروەها خوای تەعالادەفە رموێ:{وخذوا حذركم}النساء : ١٠٢ واتا : (ئاگاداری خۆتان وەرگرن)٠ هەروەها لەئیبن عومەرەوە (خوالەخۆی وباوکیشی ڕازیبێ)دەڵێ : پێخەمبەری خوا (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی : (ئەگەرخەڵکی بیانزانیبایە تەنهایی چی تێدایە ، هەرگیزهیچ کەسێك بەشەوان

بەتەنهایی ڕێی نەدەکرد)٠ عن ابن عمر(رضي الله عنهما) قال : قال النبي (صلى الله عليه وسلم) : ((لويعلم الناس مافي الوحدة ، ماساء أحد وحده بليل أبدا))رواه البخاري هەروەهائەومندالأنەی بەدەم خەوەوەدەڕۆن پێویستەلەنهۆمی سەرەوەنەنوون٠(س) دەڵێ : شەوێك بەدەم خەوەوەڕۆیشتم تالەسەربان کەوتمەخوارەوە ، هەرهیندەمزانی بەئازاری جە ستەم وهاواری دایك وخوشکەکانم خەبەرم بۆوە لەئەنجامدا دەستێکم شکا٠هەروەهالەکاتێك داکەسێك کارەبادەیگرێت واباشەدەست لەکەسەکەنەدرێت ، بەڵکوپەنابۆکوژاندنەوەی کارەبا کەببرێت٠هەروەهاکاتێك منداڵ دەگاتەتەمەنی (٤ — ٥)ساڵ پێویستە فێری ئەوەبکرێت ئە گەرلەشوێنی گشتی وقەرەبالەغ ونبوو پێویستەچی بکات ؟ پێویستەمنداڵ ناوی خۆی ودا یك وباوکی وناوی گەڕەك ومالّەکەیان فێربکرێت تاوەکودۆزینەوەی ئاسان بێت٠

قسەکردن لەگەڵ خود :

(س) دەڵێ : من لەبەرخۆم قسەدەکەم ، چونکەمن لەگەڵ خۆم باس لە هەمووئەوکێشانەدە کەم ، کەخۆم هەمە هەرلەگەڵ خۆشم بەگفتووگۆچارەسەریان دەکەم٠من قسەکردن لەگەڵ خودبەچارەسەرێکی دەروونی دادەنێم نەك بەگرفتێکی دەروونی هەرچەندە تووشی توانج دەبم٠(ل) دەڵێ : من لەبەرخۆم قسەدەکەم ، بەڵام بەدەست ئاماژەناکەم هی وام دیوە لەخۆ یەوەداویەتە قاقای پێکەنین یان لەترافیك لایت کەسم بینیوە کەسیشی لەگەڵ نەبووە یە ك شەڕی بووە جنێوی داوە یان گوتوویەتی وای لێدەکەم یان هەربەدەست ئاماژەی بەشت داوە٠

ڕووداوی هاتووچۆ :

(اعطوا الطريق حقه) رواه البخاري واتا : (ڕێگامافی خۆی بدێ)٠لەڕاپۆرتی ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی دا هاتووە ، کەسالأنە یەك ملیۆن وپێنجسەدهەزارهاولأتی لەجیهاندا بەهۆی ڕووداوەکانی هاتووچۆوە دەمرێ ، هەروەهاهۆشداری داوەتە عیراق کەڕووداوەکانی هاتووچۆی بەڕێژەیەکی زۆرهەیە٠لەتوێژینەوەکانی یەکێك لەپسپۆڕانی ئەمریکی بواری ڕ ێگاوبانەوە کەئەویش (نوربرت تیمان) لە کۆنگرەی نێودەوڵەتی دا لەبارەی ئاسایشی ڕێگاو بان کەلەساڵی (١٩٧٦) لەپاریس گیرا لەژێرناونیشانی (چۆن لەم پێشکەوتنە هەڵبێین ؟) ئۆ

تۆمبیل لەوەتەی داهێنراوە هەتا ئێستا ئەوەندە خەڵکی کوشتووە کە زیاترە لەژمارەی هە
مووئەوکوژراوانەی کە لەئەنجامی هەمووجەنگەکانی ئەم چاخە گیانیان لەدەست داوە٠
گۆڤاری سڤیل لەژمارە (١١٤)ی ساڵی (٢٠١١) دا بلاویکردۆتەوە : لەماوەی دوانزە مانگی ساڵی
(٢٠١١) دا لەسەرجەم شارەکانی هەرێمی کوردستان لەئەنجامی سەرپێچی کردنی هاولاتیان دا
(٨٨١٧١)کەس برینداربوون ونزیکەی(٧٤٩)هاولاتی مردوون٠ هۆکاری سەرەکی ئەم ڕووداوانە
ش تیژلێخوڕین وپابەندنەبوونی شوفێرە بەیاساکانی هاتووچۆوخراپی ڕێگاوبانە ، هەروەها
زیادبوونی ڕێژەی ئۆتۆمبیل ، کەئێستانزیکەی یەك ملیۆن ونیو ئۆتۆمبیل لەکوردستانداهە
یە٠بەپێی ئامارێکی تری بەڕێوەبەرایەتی هاتووچۆی هەرێمی کوردستان لەماوەی دە مانگی
سەرەتای ساڵی (٢٠١٤)دا (٤٠٠٩) ڕووداوی هاتووچۆتۆمارکراوە ، کەبەهۆیانەوە (٦٩١)کەس گیا
نیان لەدەستداوە و(١٠٣٢٥)کەسیش برینداربوون٠هەرچەندە شۆستەکان بۆپیادەڕۆدروستکرا
ون ، بەلام بەشێکی زۆری خەڵك لەسەرشەقامەکان هاتووچۆدەکەن ، لەهەندێك شوێنیش ئۆ
تۆمبیل لەسەرشۆستەکان وەستێنراون ئەمەش قەرەباڵەغی دروست دەکات٠(ئا) دەڵێ : لەسە
رشەقام ڕۆیشتن دیاردەیەکی ناشارستانییە ئەوبیانووەش هەیە کەشۆستەکان زۆرتەسك وقە
رەباڵەغن بەهۆی ئەوەی دوکاندارەکان کەل وپەلەکانیان لێ دادەنێن بەتایبەتی بۆئافرەت شا
نی بەشانی ئەم وئەودەکەوێت بۆیە پێویستەڕێگا بەدوکاندارەکان نەدرێت بەکالاکانیان شۆ
ستەکان بگرن تاخەڵك بتوانێت بەئاسانی هاتووچۆبکات٠ڕۆژانەلەشەقامەکان هەندێك ئۆتۆ
مبیل بەرچاودەکەوێت کەدەستەواژەی جۆراوجۆریان لەپشتی نوسراوە ،  کەئەمەش دەگەڕ
ێتەوە بۆچاولێکەری وگوزارشت کردن لەناخی خودی مرۆڤەکان٠ڕووداوێکی ئۆتۆمبیل ڕووی
دا بەشوفێرەکەی وت : چاوت نەیبینی ؟ گوتی : لەپشت پاصەکە شیعرێکی بەهێزنوسرابوو
دەم خوێندەوە٠ زۆرلەهەرزەکاران ، کە ئۆتۆمبیل لێدەخوڕن زۆربەتیژی دەیهاژۆن لە پلەی
(١٨٠) زۆرجارلەوپلەیەڕۆیشتوون هەتالەنێوکۆلانەکانیش! (د) دەڵێ : لێخوڕینی ئۆتۆمبیل (
چێژوڕەوشت وهونەرە)٠بۆیەنابێ شوفێرئەم سێ خاڵەلەبیربکات هۆکاری هەرڕووداوێکیش ڕ
ۆیشتنی خێرایە بەپلەیەك٠(بەلای منەوە شوفێردەبێ خاڵی یەکەم واتا چێژلەبیربکات ، چو
نکەئۆتۆمبیل خۆشترینی ئەوکاتانەیە ، کەبەخێرایی لێی دەخوڕێ)٠(ك) دەڵێ : هەندێ کە
سیش لەلێخوڕینی ئۆتۆمبیل زۆربەکاوەخۆدەڕوات تەنانەت لەکاتی هەڵبوونی گلۆپی سەوز

**یش هەرخۆی دوادەخات واتازیادلەپێویست دەترسێ٠(س) ڕووداوەکانی هاتووچۆبەئەنفال و جینۆسایدناودەبات ودەڵێ : سالأنەنزیکەی هەزاران کەس بەڕووداوی هاتووچۆدەمرێ و بر یندارو کەمئەندام دەبێ٠**

**بورجەکان :**

**خوای گەورە ئەستێرەی بۆچەند مەبەستێك دروست کردووە ، وەك : ڕووناکایی لەوشکانی ودەریاکان ، جوانی ئاسمان ، ڕەجمکردنی شەیتانەکان٠درودی خوای لەسەربێ ، فەرموویە تی :** (أربع في أمتي من أمرالجاهلية لايتركوهن : الفخربالأحساب والطعن في الأ نساب والأستسقاء باالأنواء والنياحة) رواه مسلم٠ **واتا : (چوارشت لەئوممەتەکەم داهە یە لەعادەتی نەفامین وتەرکی ناکەن : خۆنواندن بەحەسەب وبنەماڵەو جنێودان وتانەوتە شەر لەباب وباپیران وداواکردنی ڕزق وڕۆزی لە ئەستێرەکان ، و شیوەنکردن بۆمردوو)٠هە روەها ئیمامی بوخاری وموسلیم ڕیوایەتیان کردووە ، پێخەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی :** (قال الله تعالى : أصبح من عبادي مؤمن بى وكافر فأما من قال مطرنا بفضل الله ورحمته فذلك مؤمن بي وكافربالكواكب ، وأما من قال مطرنا بنوء كذاوكذا فذلك كافربي ومؤمن بالكواكب)٠ **واتا : (خوای گەورە لەفەرموودەیەکی قودسی دا دەفەر موێ : بەندەکانم هەندێکیان ئەمڕۆئیماندارن وهەندێکیان کافرن ، ئەوکەسەی وتی : لە سا یەی ڕەحم وبەزەیی ومیهرەبانی خواوە بارانمان بۆباری ئەوە ئیمانی بەمن هەیەوبێ بڕوا یە بەئەستێرە ، ئەوەش کەوتی بەهۆی فلأن ئەستێرەو بورجەوە باران باری ئەوە کافرە بە من وباوەڕی بەئەستێرە هەیە)٠خوای گەورەلەئایەتی (٨٢)ی سورەتی الواقعە دەفەرموێ : (لەباتی ئەوەی سوپاسی خوابکەن لەسەرئەورۆزییەی کە بەخشیویەتی درۆدەکەن ودەڵێن : بەهۆی فلأنە ئەستێرەوە بارانمان بۆباریوە)٠** {وتجعلون رزقكم أنكم تكذبون}

**(م) دەڵێ : خوای گەورە لەقورئان دا سوێندی بەبورج خواردووە ، کەمەبەست لەدوانزە ئە ستێرەی گەورەیە لەئاسمان دا ، بەلأم بەوشێوەیە نییە کەکراوە بەدوانزە ناوی جۆراوجۆر، چونکە جگە لەخوای گەورە هیچ کەسێکی دی غەیب نازانێت٠هەروەها زۆرجارئەم بورجا نە دەبنەهۆی نارەحەت کردنی ئەوکەسانەی کەباوەڕیان پێیەتی بۆنموونە دەڵێ : کەسێکی نزیکت خیانەتت لێ دەکات ، ئەمەش گومان پەیداکردنی لەدواوەیە٠**

**گریان :**

**گریان بریتییەلەدابارینی فرمێسك لەچاو٠ دەربارەی گریانی منداڵ لەکاتی لەدایکبوونی ئیمامی ئەحمەد فەرموودەیەکی بردۆتەوە سەرئەبوهورەیرە ، کەپێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی : (هیچ منداڵێکی تازەبوونییە کەشەیتان دەستی نەگەیەنێتێ لەکا تی لەدایکبوونی دا ، منداڵەکەش لەتاوان دەقیژێنێ وهاواردەکات بەهۆی ئازاردانەکەی تەنها مریەم وکوڕەکەی نەبێ ، کەشەیتان نەیتوانی تخونیان بکەوێت)٠**

**پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) لەکاتی مردنی کوڕەکەی دا گریاوفەرمووی : (ان العین لتدمع) رواه البخاری ومسلم٠واتا : (بەڕاستی چاوەکان فرمێسك دەڕێژن) ، بەڵام فەرمانی پێکردووین لەدەم وچاونەدەین ویەخەنەدڕین ، هەروەك دەفەرموێ :** (لیس منا من شق الجیوب ولطم الخدود ، ودعا بدعوی الجاهلیة) **واتا : (لەئێمەنییەئەوکەسەی کەیەخەی خۆی دادڕێ ولەڕوومەتی خۆی دەداوداب ونەریتەکانی سەردەمی نەفامی پەیڕەودەکات)٠**

**(ش) دەڵێ : مرۆڤ ئەوکاتەی کارەسات لەژیانی دا ڕوودەدات دەگرێت ، چونکە مرۆڤ کەلەدا یك دەبێت بەگریان لەدایك دەبێت مرۆڤ لەوژیانەدا تووشی چەندین ناخۆشی دەبێت بەگر یان دەتوانێت کەمێك لەوناخۆشیانەی کەم بکاتەوە٠(ئا) دەڵێ : گریان هەژانێکی دەروونییە لەناخی مرۆڤەوە سەرچاوە دەگرێت٠(ت) دەڵێت : گریان هۆیەکە بۆکەمکردنەوەی خەمەکا نی هەموومرۆڤێك٠(د) دەڵێ : شتێکی ئاساییە کەپیاوبگرییێت ، چونکە هەردوکیان مرۆڤن خاوەن هەست ونەستن ، بەڵام ژن لەپیاوزیاتردەگرێت٠(ن) دەڵێ : مرۆڤ بەبێ گریان دوورە لەسۆزداری ومرۆڤایەتی ، من گریاوم کەدایکم کۆچی دوایی کرد٠(ڕ) دەڵێ : لەوکاتانەی کە مرۆڤ کارەساتێکی بەسەردێ یان ئازیزێکی لەدەست دەدات دەگریێ٠(ئە) دەڵێ : گریان میکا نیزمێکی گرینگە بۆژیانی مرۆڤ ولەژیانمان پێویستمان پێ هەیە بۆنەمانی ئەوپاڵەپەستۆیە ی لەسەردەروون دروست دەبێت گریان فاکتەرە بۆکەم کردنەوەی ئێش وئازارەکانی مرۆڤ٠ (ج) دەڵێ : گریان شتێکە لەدەست مرۆڤ دا نییە٠**

**لەبارەی قەرز :**

**قەرزوەکودیاردەیەکی مرۆڤایەتی وویژدان سەیرکراوە بەتایبەتی کەسێك زۆرپێویستی پێ بێ ، بەلاّم هەندێ کەس زۆربێزاربوونە بەدەست قەرزەکانیانەوە ، بۆیەلەزۆردوکانان ئەو ڕستەیەنوسراوە : (تکایەقەرزنییە ، بۆمنیش بەڵێ بۆتۆش) ئەمەش لەئەنجامی کەمبوونە وەی متمانەلەنێوان هاولآتیان دا٠**(كان تاجر يداين الناس ، فاءذا رأى معسرا ، قال : لصبيانه : تجاوزوا عنه ، لعل الله أن يتجاوزعنا ، فتجاوزالله عنه) رواه البخاري و مسلم والنسائي٠ **واتا : (بازرگانێك هەبوو قەرزی ئەدا بەخەڵك ، ئەگەربیزانیبایە یەکێك توانای دانەوەی نییە بەمنداڵەکانی ئەوت : لێی ببورن ، بەڵکوخودا لێمان ببورێت خوداش لێی بورا٠)**

**(ح) دەڵێ : من لەئێستادا قەرزاری خزمێکمم زۆرجاری دیکەش قەرزاربووم ، بەلاّم تائێستا دیناریێکی هیچ کەسم نەخواردووە٠(م) دەڵێ : قەرزوایەبەقسەی خۆش لێت وەردەگرێت و بەشەڕوقسەی ناخۆش وەردەگیرێتەوە٠**

**سەردانیکردنی گۆڕستان :**

**پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ : ((سەردانی گۆڕستان بکەن ، چونکەدواڕۆژ تان بیردەخاتەوە))٠**

**(ن)دەڵێ : سەردانیکردنی گۆڕستان ئاسوودەییم پێدەبەخشێ واهەست دەکەم نزیکم لەئەو٠**

**(خ) دەڵێ : کوڕەکەم هەشت ساڵە کۆچی دوایی کردووە ، بەلاّم کەگۆڕەکەی دەبینم وادەزانم زیندووە٠(س) دەڵێ : سەردانیکردنی گۆڕی خزم وکەس ودۆستان بۆیادکردنەوەی بیرنەچوو نەوەی ئەوکەسەیە ، هەروەهالەکاتی چوونم بۆگۆڕستان تەنهادوعای خێربۆکۆچکردووەخو ێنم بەهیچ شێوەیەك پەنابۆگریان نابەم٠**

**پرسە :**

**بێگومان مردن ئاکامی هەمووکەسێکە ، هیچ مرۆڤێکیش بەدەرنییە لە کۆستی لەدەستدانی دۆست وخۆشەویست وئازیزانی هەربۆیە پرسە بۆتە داب ونەریتێکی باو لەنێوهەمووکۆمە**

لگاكانی جیهان، بەلاَم چۆنییەتی سازدانی پرسە لەكۆنەوە بەوشێوازە نەبووە لەكۆنەوە شێو
زێكی تایبەت لەپرسەدا هەبووە ، كەپێیان دەوت (شیوە غەریبە) كەبارگرانی نەدەكەوتە سە
رشانی خاوەن پرسەكە٠بەلاَم بەحوكمی ئەوپەیوەندییە كۆمەلاَیەتییەی كە لەنێوان تاكەكا
نی كۆمەلگەدا هەیە بایەخێكی زۆربەپرسە ورێزلێنان بۆئەوانەی دەمرن هەیە٠لەڕۆژگاری
ئەمڕۆمان دا بەرلەهەمووشتێك كەكەسێك دەمرێت لافیتەی ئاگاداری هەلَدەواسرێت وكات
وشوێنی پرسەكەی لەسەردیاری دەكرێت ئینجا لەیەكێك لەمزگەوتەكان ڕۆژانی پرسە كە
دووڕۆژە بەڕێوە دەچێت٠
پرسەئەونەریتەیە ، كەڕەگی خۆی داكوتاوە لەوناوكۆمەلگا٠خەلَك لەكاتی پرسەسەردانی كە
سەنزیكەكانی دەكات و پەیوەندی نێوان خەلَك بەهێزدەبێ٠
هەندێك پێیان وایە دانانی پرسە دەبێتەهۆی جیاوازی نێوان مرۆڤەكان٠ڕووتەلەكانیش(نیو
دیسم) ئەمانەدەلَێن جل و بەرگ بەهۆی جیاوازی نرخەكان دەبێتە هۆی جیاوازی نێوان مر
ۆڤەكان هەربۆیە بەدانەنانی جل وبەرگ جیاوازییەكان لەناودەچن !!

درۆكردن :

ڕۆژی (١)ی نیسان كەبەڕۆژی درۆكردن دانراوە درۆكەتاوانێكی گەورەیە بۆدەبێ ڕۆژی درۆ
هەبێت ؟ زۆرشتی وادەكرێت كەكارەساتی لێ دەكەوێتەوە٠(س) دەلَێ : لەسالَی (٢٠٠٧) باوكم
كۆچی دوایی كرد لەئێوارەی پێش ڕۆژی یەكی نیسان چەند تەلەفۆنم بۆخزم وكەسم كرد
وایان دەزانی درۆی نیسان دەكەم هەرچەندە دەگریام هەرباوەڕیان پێنەدەكردم پێیانم وت
وەرنەبەردەرگەی مالَ ئەوجا دەزانن ئینجاباوەڕیان كرد٠(ش) دەلَێ : بەهاوڕێیەكی منیان
وت : دایكت مرد٠بووبەگریان وقیژەلێدان لەناوفەرمانگە چووە مالَەوە دەبینێ دایكی زیند
ووە چ لەگۆڕێ نییە٠
زۆربەمان ئەگەرلەبارێكی زۆرخراپیش دابین كاتێك یەكێك ئەحوالمان دەپرسێت دەلَێین با
شم ، زۆرجاریش نەدلَمان خۆشە ونەتەندروستیشمان باشە كەلێمان دەپرسن دەلَێین باشم
، چونكەلەوانەیە ئەگەرئەوكەسەگرفتێكی خێزانی هەبێ بۆنموونە دەلَێ باشم ، ئەمەش تە
نیاڕاهاتنە كەهەمووكات بەباشەوەلاَم بدرێتەوە ، چونكە حەزناكات دەری ببڕێ كە گیروگر

فتی هەیە ، چونکەهەندێ جاربەرامبەرەکەت پێی خۆشە تۆلەناوخەم وکێشەدابی چێژلە ژیان وەرنەگری ، بەلاَم ئەوچێژلەوبارەی تۆوەردەگریَ٠(س) دەڵێ : لای من بۆیاغکردنی قژ یاخودڕەشکردنەوەی وەك ئەوەوایە دەمامکێك بکەین بەدەم وچاومانەوە دەمامکیش درۆیە و خۆشاردنەوەیە تەمەن هەروەك خۆی بێت جوانە بەو مانایەی هەرتەمەنێ جوانی خۆی هەیە ڕەشکردنەوەی پرچ دەستکاری کردنی ئەو سروشتەیە کە خوا (جل جلاله) پێی بە خشیویت ، هەروەها بەهیچ شێوەیەك لەگەڵ دەم وچاوی دا ناگونجێ ، چونکە بەگشتی دە م وچاویش لەگەڵ تەمەن دا دەگۆڕێت٠

## ناولێنانی منداڵ :

منداڵ کەلەدایك دەبێ دایك وباوك بە پێی بۆچوون وئارەزووی خۆیان ناوێکی لێ دەنێن لە زمانی کوردی دا ناوبەپێی چەندبنەمایەك دەبێت :-

١ – ناوی گیانلەبەران دەکرێتە ناوی کچان ، وەك : قومری ، مامز ، ٠٠٠هتد٠

٢ – ناوی گوڵ وڕووەك وهەرشتێك کەجوانی وناسکی تێدابێت دەکرێتە ناوی کچان ، وەك : هەنار ، سێوێ ، لیمۆ ، خونچە ، کنێر ، شیلان ، ئەستێرە ، سۆلاڤ ، بێخاڵ ، ٠٠٠هتد٠

٣ – ناوی ڕووباروچیاوهەرشتێك کەتوندی وبەهێزی تێدابێت دەکرێتە ناوی کوڕان ، وەك : سیروان ، بێستوون ، هەلگورد ، سەنگەر ، سەرباز ، ٠٠٠هتد٠

تێبینی :

درودی خوای لەسەربێ ، فەرموویەتی : (سموا باسمی ولاتکنوا بکنیتی) متفق علیه واتا : (نا وبنێن بەناوی من ، بەلاَم کونییەی من (ئەبوقاسم) مەکەنە کونییەی خۆتان)٠

## کورتکردنەوەی ناو :

(ك) دەڵێ : کورتکردنەوەی ناوبۆخۆشەویستی دەوترێت ، بەلاَم زۆرجاریش هەیە کەکەسێك بیەوێت بەسووکی بانگی کەسێك بکات ناوەکەی کورت دەکاتەوە٠ (د) دەڵێ : کورتکردنەوەی ناوشتێکەدەلالەت لەخۆشەویستی دەکات بۆنموونە ئەگەرناوی نازەنین بێت پێی دەوترێت نا زە٠(ل) دەڵێ : لەکوردەواری خۆمان دا کەئێمە ناوەکان زۆرکورت دەکەینەوە لەبەرئەوەی تا

قەتمان نییە ناوەکە بەتەواوی بڵێین ، هەشە لەخۆشەویستی دا هەندێ جاریش ناوەکە قور
سە بۆوتنی بۆئەوەی بەئاسانی بوترێت بۆیە کورتی دەکەینەوە٠

**لەبارەی دەستبلاٌوی :**

**ئیمامی موسلیم ڕیوایەتی کردووە ، کەپێخەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی :**
((فراش للرجل ، وفراش لامرأته ، والثالث للضيف ، والرابع للشيطان)) **واتا : ((**
**ڕاخەرێ بۆپیاوەکەو ڕاخەرێ بۆخێزانەکەی و سێیەم بۆمیوان و چوارەمیش بۆشەیتانە))**
**مەبەستی فەرموودەکە ئەوەیە نابێ شت ومەکی زیادە کۆبکەنەوە کەلەپێویستی زیاتربێ٠**
**(ز) دەڵێ : ژن زیاترمەسرەف دەکات لەبەرئەوەی ژن زیاتربایەخ بەجوانکاری دەدات بایەخ بەوشتانەدەدات کەپەیوەندی بەڕوالەتەوە هەیە وەك شتی زیادەی ناوماڵ وجل وبەرگ و ٠٠٠هتد٠پێویستەلەسنوری ئابوری خۆیان مەسرەف بکەن وبیریش لەدوارۆژبکەنەوە٠(س) دەڵێ : ژن زیاتربەمەسرەفن ، چونکە ئەم ژنە بەحازری بۆی دێتەوە ماڵ بەم پارە پەیدا کردنە ماندوونەبووە بۆیە بەئارەزووی خۆی مەسرەف دەکات وئەم پیاوەش تووشی خەفە ت دەبێت وبەرەوئیفلاس بوون دەڕوات٠**

**تاکی گۆشەگیروتاکی کراوە :**

**لەفەرهەنگی سایکۆلۆژی دا ئاماژە بەدووجۆرە کەسایەتی کراوە ئەوانیش کەسایەتی کراوەو کەسایەتی داخراو ، کەسی کراوە کەسێکی کۆمەلأیەتی یەو لەگەڵ خەڵکی تێکەڵە وبەئاسا نی هاوڕێ پەیدادەکات٠**
**(ه) دەڵێ : هەندێ کەس لەڕوخساردا کراوە نییە ، بەلأم لەکاتی قسەکردن وهەڵسوکەوت دا دەگۆڕێت واتا کراوەیە وهەندێ جاریش ڕەنگی جل دەربڕینێکە بۆکراوەیی وکراوەییش پە یوەندی هەیە بەدەروونەوە ، چونکە باری دەروونی کاردەکاتە سەرهەڵسوکەوتی مرۆڤ وەك : باری ئابوری ، نەخۆشی ، ٠٠٠هتد٠ئینجا کاتی بێ یان هەمیشەیی٠(ڤ) دەڵێ : کەسی کراوە چەند تایبەتمەندییەکی هەیە ، وەکو : زۆرتێکەلأوبوون لەگەڵ خەڵکی وحەزکردن بەهاوڕ ێیەتی وگاڵتەوگەپ و٠٠٠هتد٠(م) دەڵێ : کراوەیی مرۆڤ لە بەئاسایی وەرگرتنی ڕەخنەوگلە**

یی ودوورلەگرژی وئامادەی ڕاستکردنەوەی هەڵەکان دەبینمەوە٠(م) دەڵێ : بێگومان کەسی کراوە خۆشەویستە ، بەلاَم کەسی داخراو چونکە تێکەڵی کەس نابێت لەبەرئەوە زۆرجارئە وکەسانە تووشی خەمۆکی دەبن ، وە هەرکەسێکیش خۆی لە کەسانی تربەرزترنەزانێت کە سێکی کراوەیە٠کەسانێك هەن کەمدوون ئەوکەسانە مەرج نییە خۆیان گەورە بێتە بەرچاو ئەوکەسانەی خۆیان لەکۆمەڵ بەدووردەگرن زۆرجارگرفتی ژیانی ڕۆژانەیان هەیە بۆیە غە مباری وماتەمینییان لێ بەدی دەکرێ ، زۆرئاساییە کەسێك بارودۆخێکی ناهەموار یەخەی بگرێ گۆشەگیری دایبگرێ بۆیە نابێ گلەیی وگازاندەیان لێ بکرێ٠

بنیشت جووین :

(ژ) دەڵێ : بنیشت جووین لەشوێنە گشتییەکان زۆرناشیرینە چ بۆپیاوان چ بۆئافرەتان٠
(ش) دەڵێ : بەڕای من هەمووخواردن وخواردنەوەیەك شوێن وجێگای خۆی هەیە بەتایبە تی بنیشت جووین لەشوێنەگشتییەکانی وەك : بازاڕ یان لەشوێنی کار زۆرلەکەسایەتی ئەو کەسە کەم دەکاتەوە من خۆم ئەگەرلەدەروەی ماڵ بم هیچ کاتێك بەکاری ناهێنم بەڕای من بنیشت جووین لەکەسایەتی هەردووڕەگەزکەم دەکاتەوە بەتایبەتی کاتێك بەشێوەی گلۆپ پفی دەکەن ودەی تەقێنن زۆرخەڵکی هەراسان دەکات٠(ك) دەڵێ : بنیشت جووین بۆماسو لکەکانی دەم وچاوباشە ، چونکە وەك وەرزشێك وایە بۆماسولکەکان ، بەلاَم لەدەرەوەی ماڵ بێزارکەرە٠

لەبارەی دزی وئاکامەکانی :

زۆربەی جارتاوانی دزی سەردەکێشێ بۆکوشتن کاتێك کابرای دزدەبینێ خەریکە کارەکەی ئا شکرادەبێ٠دزیکردن ڕۆڵێکی گرینگ دەبینێ  لەسەر لاوازبوونی پەیوەندی کۆمەلاَیەتی تاوا نبارلەگەڵ کۆمەڵگا ئافرەتێك کەپیاوەکەی تاوانی دزی ئەنجام دابوو ، دەڵێ : خەڵك تانەیان لێدەدام ودراوسێکانم هاتووچۆیان نەدەکردم تاکوچوومەوە ماڵی باوکم هەستم دەکرد کەمن دزییەکەم کردووە زیاترڕقم لەبەرامبەرمێردەکەم هەڵدەگرت تالێی جیابوومەوە٠(ك) دەڵێ : ئامادەنیم هاوڕێیەتی کەسێك بکەم کەتاوانی دزی ئەنجام دابێ٠سەبارەت بەکارکردن بەڕ

یۆوەبەری کۆمپانیایەك دەڵێ : کاری پێنادەم ، چونکە ناتوانم متمانەی پێبکەم ، چونکە دە بێ بەردەوام چاودێری بکەم هەرچەندە بڕوام بەوەهەیە کەمرۆڤ قابیلی گۆڕانە٠خاوەن کا رێکی تردەڵێ : ئەگەرهاتووگۆڕانکاری لەژیانی کردبوو خۆی چاك کردبوو ئامادەم کاری پێ بدەم ، چونکە مرۆڤ قابیلی گۆڕانە هەمووکەسێکیش هەڵە دەکات٠سەبارەت بەهاوسەرگیری ڕەنگە ئەوکەسەی تاوانی دزی ئەنجام داوە نەتوانێت بەئاسانی هاوسەرگیری بکات ، چونکە ناوی بەخراپ ڕۆیشتووە٠(ل) دەڵێ : ئامادەنیم خزمایەتی لەگەڵ کەسێك بکەم کەتاوانی د زی ئەنجام دابێ ، چونکە ئەگەرخزمایەتی لەگەڵ بکەم لەوانەیە خەڵك بڵێ کەسایەتییان لێك نزیکە بۆیە خزمایەتییان لەگەڵ یەکترکرد٠

تێبینی :-

لەئاینی ئیسلام دا ئەگەرهاتوو کێشەی دزی نەگەیشتبووە لای قازی کەسێك بکەوێتە نێوا نیان بۆجێبەجێ نەکردنی دەست بڕینەکە ئەواحەددەکە لادەبرێ٠لەگێڕانەوەیەك دا هاتو وە کە (صەفوانی کوڕی أمیە) یەکێك هاتووعەباکەی سەرشانی لەژێرسەری دا دەرهێنا ، هێنایان بۆلای پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) ئەویش فەرمانی کرد دەستی ببڕن ، صە فوانیش وتی : من دەیبوورم٠درودی خوای لەسەربێ فەرمووی:(هلا قبل أن تأتيني به ؟) واتا : (بۆچی پێش هێنانی بۆلای من عەفووت نەکرد؟)٠

لەبیرچوونەوە :

وتراوە ئینسان لە (نسیان)ەوە هاتووە واتا (لەبیرچوونەوە) ، بۆیە شتێکی سروشتی یە توو شی هەموومرۆڤێك دەبێت٠ بەڵام زۆرجاربۆتەهۆی ئەوەی خەڵکانێك ڕووبەڕووی گومانی خراپ ببنەوەیان ڕووبەڕووی ڕەخنەوگازاندە ببنەوە بەتایبەتی کاتێك کارێکی پێ دەسپێر ن بەهۆی لەبیرچوونەوە ئەنجامی نادات٠

(هـ) دەڵێ : تائێستا دووجار شوفێری پاص بەبیری هێناومەتەوە ، کەپارەم نەداوە پێش ئەو ەی دابەزم بەبیرم هاتۆتەوە کەپارەم نەداوە٠(ئا) دەڵێ : ئێستا گرفتی دنیائەوەندە زۆربووە خەڵك تووشی لەبیرچوونەوە دەبێت جاری واهەبووە لەبازاڕشتم کڕیوە پارەکەشم داوەتێ شتەکانم لەدوکانەکە بەجێهێشتووە٠ڕۆژێك ئۆتۆمبیلەکەم لەگەراجی بازاڕ ڕاگرت دەمەو

ئێوارە گەڕامەوە ماڵەوە ، ماڵەوەمان پێیان گوتم کوائۆتۆمبیلەکەت ؟ ئەوجا بیرم کەوتەوە کەئۆتۆمبیلەکەم لەگەراج ڕاگرتووە٠

**شاعیرانی کورد :**

زۆربەی شاعیرانی کورد خاوەن دووناون ، ناوی یەکەمیان ناوە ڕاستەقینەکەیانە کەناوی تە مەنی منداڵییانە ، ناوی دووەمیشیان ناسناوە شیعرییەکەیانە٠تەنانەت هونەرمەندەکانیش خاوەن دووناون ، بۆنموونە : ئوم کەلسووم ناوی ڕاستەقینەی فاتیمەیە ، مەرزییە فەریقی ناوی خۆی ئایشێ یە ، هایدە ناوی مەعسوومەیە ، مەهەستی ناوی فاتیمەیە ، ٠٠٠هتد٠

**شێخ ڕەزای تاڵەبانی :**

ناوی ڕاستەقینەی (ڕەزا)یە ، لەعەشیرەتی زەنگەنەیە ، لەساڵی (١٨٣١)لەگوندی (قرخ) لەناو چەی چەمچەماڵی سەربەشاری کەرکوك لەدایکبووە٠(چەمچەماڵ ئێستا سەربەشاری سلێما نی یە)لەساڵی (١٩١٠) بەنەخۆشی زەحیری کۆچی دوایی کردووە و لەگۆڕستانی گەیلانی لە نزیك شێخ عەبدولقادری گەیلانی نێژراوە٠

نموونەیەك لەشیعرەکانی :

میربەسەد میننەت   هەناردی ئێسترێکی ڕووت و  قووت
چوارپەلی سست وسەقەت ئەندامی هەروەك عەنکەبووت
خاوەنی ئالیکی ناڵێم پێ نەداوە موتلەقا
داویەتی ئەمماوەکوبیستوومە قووتی لایەمووت (لایەمووت : مەمرەومەژی)

نموونەیەکی تر :

گەرچی فەقیروموفایەر ((مامەشێخ سالحم))
نەمدی کەسێ وەکوئەوساحێبی کەرەم
میوانی بووم لەنان وکەرەی نایە بەدەمم
ئێستاش بەبێ موداهەنە مەمنوونی ئەوکەرەم

**کانی :**

**ناوی خۆی عەبدولجەبارە ،لەبنەماڵەی دۆغرەمەچییەکانە ، لەساڵی (١٩٥٧) کۆچی دوایی کر دووە٠**

**نموونەیەك لەشیعرەکانی :**

**خزمینە وەرن تاکوبەقوربانی وەتەن بین**

**قوربانی چیاودەشت وبیابانی وەتەن بین**

**تاکەی لەکون وقوژبنی وێرانە بمێنین**

**بائیدی لەسەرکۆششی عیمرانی (ئاوەدانی) وەتەن بین**

**نموونەیەکی تر :**

**"ژن"**

**ئەم بەیتە بۆژنانە**

**بۆخراپ وچاکانە**

**زۆرڕاستە ئەم قسانە**

**چی گوترابێ وەهانە**

**هەندێك ژن هەندێك ژانە**

**هەندێك ڕوحی ڕەوانە**

**هەندێك فیتنەوشەیتانە**

**هەندێك حەرەم گرانە!**

**هەندێك قووتی دڵانە**

**هەندێك کەرونەزانە**

**هەندێك خان وخەرمانە**

**هەندێك ئێسك گرانە**

**هەندێك بەدخوونەبانە**

**هەندێك جانی جانانە**

**هەندێك ئیشی بوختانە**

هەندێك سوسن وڕەیحانە

هەندێك بێ قوونەبانە

هەندێك پوختەوكابانە

هەندێك سەی قەسابخانە

هەندێك شاهی جیهانە

هەندێك بێ ڕزق ونانە

هەندێك دەوای دەردانە

هەندێك لۆتیی مەیدانە

هەندێك گوڵی باخانە

هەندێك ژەهرزووبانە

هەندێك مەجلیسی جوانە

هەندێك نزیك بەڵانە

هەندێك چرای شەوانە

هەندێك بێ دەركەوبانە

هەندێك شۆخی زەمانە

هەندێك تەوقی ملانە

هەندێك تاجی سەرانە

مەقسەدم لەم بەندانە

بۆصوحبەت وگەمانە!

كانی لەم هۆنراوەیەدا دوونموونەی ئافرەتمان بۆدەستنیشان دەكات ، هەرچەندە دەڵێ : ئەم هۆنراوەیەم بۆسوحبەت وگەمەداناوە ، بەڵام لەڕاستیشدا هەروایە٠

حاجی قادری كۆیی :

ناوی خۆی (قادرە)ە لەگوندی (گۆڕقەرەج)ی سەربەشارۆچكەی كۆیە لەدایكبووەساڵی لەدایكبوونی بەتەواوی نەزانراوە هەندێك سەرچاوە ساڵی ١٨١٥ و هەندێكی تر١٨١٦ و هەندێك ١٨١٧ وهەندێكیش ١٨٢٤ بەساڵی لەدایكبوونی دادەنێن٠حاجی تاكۆتایی ژیانی ژنی نەهێناوە

بێ ژن ومندالْ بووه٠دەڵێن لەساڵی ١٨٩٧ كۆچی دوایی كردووه و لەئەستەمبۆڵ لەگۆڕستانی قەرەج ئەحمەد نێژراوه٠

نموونەیەك لەشیعرەكانی :

لەغوربەت بەشاهی لەبیرناكرێ

زەمانی جوانی ویادی ولاْت

لەقوشخانه وه تادەمی ئیچ قەلا

لەبایزاغەوه تامەحەللەی قەلات

هەمووخزمی خۆمن دەزانم دەڵێن

لەبێ حورمەتییان بووحاجی هەلاْت

قوشخانەوئیچ قەلاوبایزاغەوقەلات چوارگەڕەكی شاری كۆیەن٠

نموونەیەكی تر :

سەروریشم سەراپابۆتەلۆكە

شەوێ هەمرازمه پشمین وكۆكه

نموونەیەكی تر :

لەگاوان وشوانی كورد یەك

بەسەبۆلەشكری صەد كەڕڕەدوولەك (دوولەك بەمانای دووسەد هەزار)

حەمدی :

ناوی ڕاستەقینەی (محەممەد)ه كوڕی مەلاعوسمانی بالخی یه (بالخ گوندێكە لەناوچەی ماوه تی شاری سلێمانی) لەساڵی (١٩٠٦) كۆچی دوایی كردووه٠

نموونەیەك لەشیعرەكانی :

فەزیلەی ئەصلْ وفەصلْ ئینسانی پێ نابێ بەصاحێب فەزل

كه تۆكۆسەی ، بەتۆچی مامه ڕیشی باب وباپیرت!

نموونەیەكی تر :

عەهدو وەفایە سوخرەیی بەوعەهدی یوجەفا

هەرمابەدادی ئەهلی وەفادا بگاتە خودا

واتا بێ وەفایی ئەوەندە پەرەی سەندووە عەهدووەفابووە بەگاڵتەجاڕی وەفاداران دادوبێ دا دیانە لەخودا دەپاڕێنەوە کەلەچنگی بێ وەفایی ڕزگاریان بکا٠

وەلی دێوانە :

ناوی خۆی (وەلید)ە مرۆڤێکی نەخوێندەواربووە پیشەی شوانی بووە ، لەتیرەی میکائیلی یە لەعەشیرەتی جافە ، لەناوچەی (بەکرئاوا)ی لای هەڵەبجە لەدەوروبەری ساڵی(١١٦٠)ی کۆچی لەدایکبووە ، عەشقی کچێکی سەرەك خێلی جاف بووە ، کەناوی (شەمسە)بووە٠

نموونەیەك لەشیعرەکانی :

یاران وەسیەتم ئەمە بێت لاتان

هەرچەند کەوتوومە دوورە ولأتان

تەنیاگۆڕەکەم لەڕێی خێلان بێت

نزیك هەوارگەی جاف وگۆران بێت

کێلێکی بەرزیش بەقەد بالأی شەم

لەژوورسەرم بێت بێ زیادوبێ کەم

وەفایی :

وەفایی ناوی میرزا عەبدولڕەحیمی کوڕی مەلا غەفورە ، سەرچاوەکان ساڵی (١٨٤٤) بۆساڵی لەدایکبوونی دادەنێن ، خەڵکی شاری (سابلاغ)ە٠

پیرەمێرد :

ناوی (تۆفیق)ە ، لەساڵی (١٨٦٧)لەشاری سلێمانی لەگەڕەکی (گوێژە) لەدایکبووە٠لەساڵی ١٩٥٠ کۆچی دوایی کردو لە(گردی مامەیارە)نێژراوە٠

نموونەیەك لەشیعرەکانی :

لای من بەخوێندەواری یە ، ئاە خوێندەواری یە

هەرمیللەتێ کەفەننی نەبێ دەردی کاریە

نموونەیەکی تر :

ئەم ڕۆژی ساڵی تازەیە نەورۆز هاتەوە

تاکۆتایی شیعرەکە٠٠٠

نموونەیەکی تر :

سبەینێ بوولەخەوهەستام ، کەڕوانیم بەفربارییوە

سلێمانی ئەڵێی بەلقیسە تارای زیوی پۆشیوە

دەمێك بووچاوەڕێی بەفرێکی وابووم

سەرم بەفرە کەچی هێشتا شەڕە تۆپەڵمە بۆیاری

نموونەیەکی تر :

پایزی دڵتەنگ

پایزدڵتەنگە ، پایزدڵتەنگە

هەوری نوێی پایز زویرودڵتەنگە

ڕەشەبالێمان بەژاروژەنگە

گەڵاڕێزانە گوڵ ئاڵتوون ڕەنگە

نموونەیەکی تر :

گیانە بەسییەتی

گیانە بەسییەتی ، گیانە بەسییەتی

توخوابەسییەتی دەردومەینەتی

ئازیزدڵەکەم کلۆکۆیەتی

ئارەزووی تیری پەنجەی تۆیەتی

نموونەیەکی تر :

باوەژن چەپۆك ئەدا لەهەتیو

هەرگیزفێرنابێ ڕێی ئەم دیوەودیو

ستەمکاری

هەورئەگری بەکوڵ ، گوڵ پێئەکەنێ

باوك وفرزندەی بێ ڕەحم ئەنوێنێ

نموونەیەکی تر :

داروفەلاقەی باوکم لاخۆشە

بەلاٌم غەرەزكاربۆچ لێم بەجۆشە

كۆستی نوێ

دیسان واكۆستی نوێمان كەوتەوە

گەڕی گەردوونە كوردی گرتەوە

تاكۆتایی شیعرەكە ٠٠٠

بۆچوارئەفسەرەكەی نووسیووە ، كەلەساڵی (١٩٤٧) لەسێدارەدران٠

نموونەیەكی تر :

گۆرانی بەهار

كەدەڵێن ئەمڕۆ دەشت وكێوشینە

چەندە مەڵبەندی ئێمە شیرینە

بچۆسەرگردی یارە ببینە

لەجیهاندا گوڵێكی ڕەنگینە

چونكە وایە خوایە ئاوابێ

قانع :

ناوی (محەممەد)ە ، لەساڵی (١٨٩٨) لەگوندی ڕیشین لەبناری شارەزوور لەدوای چواردە خو شك چاوی بەدنیاهەڵهێناوە٠

نموونەیەك لەشیعرەكانی :

كوڕی كوردم خەریك بن بێنەفرمان

لەگۆڕنێن تەمبەڵی وبێكاری جاران

عەرەق بڕژێ لەسەرخاكالەبەرپێت

لەڕێی ئیشكردن بۆبەرگ وبۆنان

مەڵێ عەیبەمەڵێ ناچم لەبۆكار!

مەڵێ ئاواتمە سەردان وسەیران

برام عەیب نییە شوانی وسەپانی

ئەبەخشن فەخروشانازی بەئینسان

بەسەربەرزی بژی تاماوە ژینت

نەکەی ملکەچ بکەی لەبەرکۆشك وتەلاران

نموونەیەکی تر :

مازووچنینی لادێ

ژینی لادێ سەیرانە

گەرچی تۆزێ گرانە

ڕۆژی نەورۆز ، ئەوەل ساڵ

ئەکەونە ئیش کوڕوکاڵ

یاجووت ، یاجۆگە هێنان

بۆئاوداشتن دەغڵ ودان

یاتووتنە یادرەو

ناوەستن بەڕۆژوشەو

یاگێرە ، یاشەن کردن

هەڵمەت بۆفرمان بردن

فەرقی نییە نێرومێ

هەرچی دانیشتووە لەدێ

هەمووخەریکی فرمانن

بەدەستهێنانی نانن

تاتەواوئەبێ هاوین

تێئەکۆشن زۆربەتین

نموونەیەکی تر :

(ئالأکەم)

ئەی ئالأی بەرزی سێ ڕەنگی جوان

**هەرشەكاوەبێ تائاخرزەمان**

**تۆیادگاری سەلاحەددینی**

**خواكۆمەكت بێ چەندە شیرینی**

★ ★ ★

**سوریت نیشانەی شەهیدانمانە**

**سەوزیت نیشانەی دەغڵ ودانمانە**

**سپیت نیشانەی ئاشتی ولاّتە**

**ڕۆژی ڕووناكی ڕێگەی نەجاتە**

**گەنمت یانێ های كوردە بزانە**

**نانێ خۆت مەنێ دەستی بێگانە**

**قەلەمت مانای ، تاڕۆژی مردن**

**تێكۆشن لەڕێی زانین وخوێندن**

**نموونەیەكی تر :**

**ڕۆژێ ئەبێ كوردستان**

**ئەدەب بكرێ ، بەگران**

**یەكێ ئەپرسێ لەدوو**

**نازانن ڕەنگی چۆن بوو؟!**

**صافی :**

**ناوی كاك مستەفایە ، لەساڵی (١٨٧٣) لەگوندی (هیران)ی سەربەقەزای شەقلاوە لەدایكبووە٠ "كاك" ناسناوی گەورەی ئاینی یە ،صافی واتا پاكی وبێگەردی دڵ واتا پاكی دەروونی صۆفیا نەی٠ناوی هیران ونازەنین لەگەڵ یەك دێت ،چونكە دەڵێن ئەودووكانیاوانەی باخەكانی هیرا ن ونازەنینیان ئاودا ، هی دووخوشك بوون بەناوەكانی ئیران ونازەنین٠صافی لەساڵی (١٩٤٢) كۆچی دوایی كرد٠صافی پەیوەندبووە بەتەریقەتی قادری ، "تاهیرتۆفیق" كەلەساڵی (١٩٢٢) لەكۆیە لەدایكبووە ولەساڵی (١٩٨٧) كۆچی دوایی كردووە زۆرلەشیعرەكانی صافی كردووە بە گۆرانی٠**

**نموونەیەك لەشیعرەكانی :**

**ئەوپەرچەم وئەگریچە هەموودوشمنی دینە**

**ئەوزولف وڕووئافەتی سەرڕووی زەمینە**

**نموونەیەكی تر :**

**من ودلْ ئیمڕۆ ئەوشۆخە لەخۆشی یەك بەوەی كردین**

**لەجامی لەعلی سەرخۆش وموقیمی مەیكەدەی كردین**

**هەتامەحشەرخوماروەمەستی نازو نەشئەی كردین**

**بەغەمزەی چاوی مەخموری سیاهی مەستی مەی كردین**

**بەماچی لێوی موستەغنی لەئەنواعی مەزەی كردین**

**لەبۆیەك مەرحەبایێ چوومە لای یارم بەسەرخۆشی**

**نیقابی خستە ڕوخسارو بەجارێ كەوتە خامۆشی**

**كەوام دی ڕۆیی ئارامی دلْ وسەبروفەرامۆشی**

**بەهەوری پەرچەم وزولفی ڕوخ وئەبرۆی كەداپۆشی**

**لەشەوقی ڕونیەتی بەدری هیلالی یەك شەوەی كردین**

**ئەحمەدێ نالبەند :**

**ناوی ئەحمەدكوڕی ئەمینی نالبەندە بە(ئەحمەد موخلیس)یش ناسراوە٠لەگوندی (ڕووسێ) لەقەزای زاخۆلەدایكبووە ، بەلاّم ژیانی خۆی لە بامەڕنێ بەسەربردووە٠لەسالّی (١٩٦١) بەدەستی خۆی خۆی كوشتووە٠**

**نموونەیەك لەشیعرەكانی :**

**(زولەیخا)**

**دوهی سپێدێ ل سەربانی**

**م جانەك دیت ژخەوڕابوو**

**ژمال دەركەت دەرێ خانی**

**م تەخمین كرد زولەیخابوو**

**فانی :**

**ناوی مەمەند ئاغایە ، لەتیرەی میراودەلی پشدەرییە لەساڵی (١٩١٠) لەدێی مەرگە لەدایکبووە لەساڵی (١٩٧٣) کۆچی دوایی کردووە٠**

**ناصیح حەیدەری :**

**ناوی (ناصیح)ە بەنۆپشت دەچێتەوە سەرحەیدەری یەکەمی باپیرە گەورەی بنەماڵەی حە یدەرییان ، لەساڵی (١٨٩٨) لەقەلای هەولێرلەدایکبووە لەساڵی (١٩٨٦) کۆچی دوایی کردووە٠**

**حەمدی :**

**ناوی ئەحمەدە لەبنەماڵەی صاحێبقرانە لەساڵی (١٨٧٨) لەشاری سلێمانی لەدایکبووە٠لەساڵی (١٩٣٦) کۆچی دوایی کردووەولەگردی سەیوان نێژراوە٠**

**نموونەیەك لەشیعرەكانی :**

**بۆهەوائاڵۆزە بۆچی لێڵ وسوورە ئاسمان ؟**

**گێژەلووکەی نەگبەتە یافیتنەی ئاخرزەمان**

**حەمدی ئەم شیعرەی بۆڕۆژی (٦)ی ئەیلوولی ساڵی (١٩٣٦) وتووە ، کەلەورۆژەدا شاری سلێما نی خۆپیشاندانێکی گەورەی گێڕا٠**

**بێکەس :**

**ناوی ڕاستەقینەی (فایەق)ە ، لەساڵی (١٩٠٥) لەگوندی سیتەك لەباکوری ڕۆژهەلأتی سلێمانی لەدایکبووە٠لەساڵی (١٩٢٨) بۆماوەی چەندمانگێك لەهەولێرژیاوە ، لەساڵی (١٩٤٨) بەتەوژمی خوێن کۆچی دوایی کرد٠**

**نموونەیەك لەشیعرەكانی :**

**کوردئەبەدناگاتە مەقصەد نۆکەری بێگانەیە — دوودڵن پیسن لەگەڵ یەك بۆیەوابێلانەیە**

**میللەتێکن بۆنەمانی یەكترى هەرهەوڵدەدەن — داخەكەم وردودرشت شێت وشەیدای عانەیە**

**نموونەیەکی تر :**

**قەومی کورد ئیسپاتی کرد بۆعالەمی سەرڕووی زەمین**

**میللەتێکی قارەمانن هەرئەبێ سەربەست بژین**

نموونەیەکی تر :

(داری ئازادی)

داری ئازادی بەخوێن ئاونەدرێ قەت بەرناگرێ

سەربەخۆیی بێ فیداکاری ئەبەد سەرناگرێ

پیاوئەبێ بۆسەندنی حەقی لەمردن سڵ نەکا

هەربڕوخێ بەس نییە ، تاکونەسەنرێ نادرێ

نموونەیەکی تر :

(بیست وحەوت ساڵە)

بیست وحەوت ساڵە من ڕەنجبەری تۆم

بەنان وئاووجل وبەرگی خۆم

خزمەتم کردی لەئێران وڕۆم

لەپێناوی تۆشکاوە ئەستۆم

کەچی هێشتاهەردیل وڕەنجەڕۆم

گوناهم چی بوو بەم دەردەت بردم ؟!

بۆچی بەناهەق واسووکت کردم ؟!

نموونەیەکی تر :

(فیزولەخۆبایی بوون)

بۆوا بەلارولەنجە

ئەڕۆی بەنووکی پەنجە

تێبفکرە لەژێرپێتە

هەرگۆڕی پیروگەنجە

زۆرعەیبە دەعیەلێدان

بەسەرئێسقانی ئینسان

تاکۆتایی شیعرەکە ...

نموونەیەکی تر :

**(قومار)**

**واسلێمانی گشت ئینتیزامی**

**هاتە سەریاری (پۆکەر) و (ڕامی)**

**بلاْوبۆتەوە لەناوخاس وعام**

**(جۆکەر) یان کردە وێردی سوبح وشام**

**گەربێ خەبەری لەم ئەحوالانە**

**شەوبچۆرە ئەوچاخانانە**

**ئەوسائەبینی لەهەموولایەك**

**هەرچەند کەسێکەوچۆتە پەنایەك**

**تاکۆتایی شیعرەکە ٠٠٠**

**نموونەیەکی تر :**

**(عارەق ئەخۆم)**

**من عارەق ئەخۆم کەبێ کەدەربم**

**کەمێ لەدنیای دوون بێ خەبەربم**

**گەڵێ سزام دی لەڕووی عەقلەوە**

**بادەی مەی بخۆم بێ هۆش وکەربم !**

**ئەسیری :**

**ناوی خۆی (عەبدولخالق)ە ، لەشاری کەرکوك لەدایکبووە٠ژنی نەهێناوە ، ناسناوی ئەسیری بۆخۆی هەڵبژاردووە ئەم ناسناوەی لە "ئیبن ولئەسیر" وەرگرتووە ، کەمێژوونوسێکی هاو چەرخی سەلاحەددینی ئەییوبی بووە٠لەساڵی (١٩٦٠) تووشی نەخۆشی شێرپەنجە بووە بوو هۆی مردنی لە (١٨ /٦/١٩٦٢)٠**

نموونەیەك لەشیعرەكانی :

(بێرە كوردستان)

بێرەكوردستان عەزیزم گەرتۆسەیرانت دەوێ

بت بەمە قەندیل ئەگەرگوڵزاری كوێستانت دەوێ

سەیری ئەوخێڵانە كەنیشتوونە داوێنی چیا

بابچین بۆماڵی كوردی گەرتۆخۆیشانت دەوێ

خۆیشان : قەوم وخزم

عەونی :

ناوی (عوسمان)ە ، لەساڵی (١٩١٤) لەكۆیە لەدایكبووە ، لەساڵی (١٩٩٢) كۆچی دوایی كردووە٠

ناڵی :

ناوی (خدر)ە ، لەگوندی خاك وخۆڵ لەناوچەی شارەزوور لەدایكبووە٠

نموونەیەك لەشیعرەكانی :

تەبعی شەككەر باری من كوردی ئەگەرئینشادەكا

ئیمتیحانی خۆیە مەقسودی بەعەمدەن وادەكا

نموونەیەكی تر :

پێم دەڵێن مەحبووبە خێل وقیچە مەیلی شەڕدەكا

خێل وقیچە یاتەرازووی نازی نەختێ سەردەكا

زێوەر :

ناوی (عەبدوڵلاّ)یە ، بەبنەچە پشدەری یە ، لەساڵی (١٨٧٥) لەشاری سلێمانی لەگەڕەكی كا نیسكان لەدایكبووە٠لەساڵی (١٩٤٨) كۆچی دوایی كردووە ولەگردی گولاّن (حجۆگە) نێژراوە٠

نموونەیەك لەشیعرەكانی :

(عەرەق ناخۆم)

**عەرەق ناخۆم کەتووشی دەردی سەربم**

**گرفتاری هەزاردەردوخەتەربم**

**هەرچی خوا حەزئەکا ئەیکەم بەسرڕی**

**ئیتربۆشەرمەزاری ناوبەشەربم**

**عەرەق ناخۆم کەعومرم کورت وکەم بێ**

**بەجوانی بۆگرفتاری زەرەربم**

**عەرەق ناخۆم کەدوچاری وەرەم بم**

**هیلاکی خەستەگی قەلب وجگەربم**

**عەرەق ناخۆم کە** مقطوع النسل **بم**

**حەزم وایە کەبابی سەد پسەربم**

**تاکۆتایی شیعرەکە ٠٠٠**

**شێخ نوری شێخ سالح :**

**ناوی (شێخ نوری کوڕی شێخ سالح)ە ، لەسەیدەکانی بەرزنجەیە ، لەساڵی (١٨٩٦) لەشاری سلێمانی لەگەڕەکی دەرگەزێن لەدایکبووە٠**

**نموونەیەك لەشیعرەکانی :**

**(دڵی من)**

**لەوڕۆژەوە تۆی دیوە پەریشانە دڵی من**

**سەودا زەدەو بێ سەروسامانە دڵی من**

**پیشەی خەفەت وشیوەن وگریانە دڵی من**

**گاوێڵی کەژوکێووبیابانە دڵی من**

**گادەربەدەری کوچەین شارانە دڵی من**

**سەرگەشتە ئەسوڕێتەوە بێ لانە دڵی من**

**هەرچەندە بەدوویائەگەڕێم شارو ولأتان**

**دەشت وکەژوسەحراوچیا ، چۆڵ وبیابان**

**نایدۆزمەوە بێسەروشوێن ڕۆییوە دیسان**

شێتانە ئەبێ ڕووی لەچ لاکردبێ یاران
وەك بلبلەکەی وێڵی گوڵستان بەبەهاران
ئاخۆلەچ گوڵزارێ ، غەزەلخوازە دڵی من
تاکۆتایی شیعرەکە ٠٠٠
نموونەیەکی تر :

(شەو)

خۆت بپارێزە لەئاهی دڵ بریندارانی شەو
نەك خودا ناکەردە گیرابێ ، دوعای ناڵانی شەو
یاوەرویارئەنیسم ، ئاهوئەشکی حەسرەتە
ئافەرین ئەی بارەکەللاٌ ، دیدەیی گریانی شەو
تاکۆتایی شیعرەکە ٠٠٠
مستەفابەگی کوردی ساحێبقران :
ساحێبقران ناوی خانەوادەیەکی دێرینی کوردستانی ئێرانە٠مستەفابەگ ناسناوی کوردی بۆ خۆی هەڵبژاردووە لەسۆنگەی هەستی نیشتیمانی ونەتەوەییەوە ، مەحمودبەگی باوکی بەنا وی باپیری خۆیەوە ناوی ناوە مستەفا٠
نموونەیەك لەشیعرەکانی :

(صەدای سەمتوورە)

سەدای سەمتووری کەللەم گەرمە ئەمشەو
چریکەوبانگی دڵ بێ شەرمە ئەمشەو
بەناخووی لەکاری فەرهاد دێ لەدەستم
وەها شاهولە سینەم نەرمە ئەمشەو
لەتەنهایی بەیادی ڕۆحی مەجنوون
خەیاڵی گەشت دەشت ودەرمە ئەمشەو
کەقاپی تۆصەبووری دەرمە ئەمشەو
تاکۆتایی شیعرەکە ٠٠٠

**صەدا : دەنگ ، ئاواز**

**سمتوور : ئامرازێکی مۆسیقی یە**

**ئاخوون : نینۆك**

**نموونەیەکی تر :**

**(زەمانی فیرقەتی یارانە ئەمشەو)**

**زەمانی فیرقەتی یارانە ئەمشەو**

**ئوفوولی زوهرەیی پایانە ئەمشەو**

**بلێسەی ئاگری شەوقی دەروونم**

**وەکودۆزەخ سزای تۆفانە ئەمشەو**

**لەئەشکی لەعل گوونی چاوی تارم**

**لەئەفلاکا مەلەك گریانە ئەمشەو**

**لەبێ ئارامیا ، چۆن شەق نەبادڵ ؟؟**

**لەجەوری دڵرەقی جانانە ئەمشەو**

**تاکۆتایی شیعرەکە ۰۰۰**

**عاصی :**

**باوك وباپیری بەبنەچە دەگەڕێنەوە بۆگوندی (خرابە)ی لای تەقتەق سەربەشارۆچکەی کۆ یە ، ناوی خۆی مستەفایە لەساڵی (١٨٨٥) لەگوندی (خرابە) لەدایکبووە۰لەساڵی (١٩٧٥) لەکۆ یە کۆچی دوایی کردو لەگۆڕستانی شەهیدان بەخاك سپێردرا۰**

**نموونەیەك لەشیعرەکانی :**

**ئیلاهی شیشەیی عومرم بەبەردی میحنەتی دووری**

**شکاپڕژا بەیەکجاری شەرابی کەیف وسرووری**

**تاکۆتایی شیعرەکە ۰۰۰**

**ویسالّی :**

**ناوی محەممەدە ، لەگوندی تەکیەی قەرەداغ لەسالّی (١٩٠٢) لەدایکبووە٠**

**نموونەیەك لەشیعرەکانی :**

**براگەل مژدەبێ لێتان لەلاتان**

**ئەوارۆیی ڕەفیقی بێ هەواتان**

**شاعیرئەم پارچە شیعرەی لەسەرهەمان کێش وسەروای شیعرێکی مستەفابەگی کوردی داناو ە ، کەدەڵێ :**

**ڕەفیقان ئەمن ئەوارۆییم لەلاتان**

**لەمەزلوومان بەلاّ چۆڵ بێ ولاّتان**

**بێخود :**

**ناوی (محمود)ە، لەسالّی (١٣٧٦)ی کۆچی بەرامبەربە (١٩٥٥)ی میلادی کۆچی دوایی کردووە٠**

**نموونەیەك لەشیعرەکانی :**

**لەورۆژەوە ڕۆیشتووە تۆراوە دڵی من**

**هەرچەندە ئەگەڕێم بێ سەروشوێن ماوە دڵی من**

**ئاخۆبەچ شاخێکەوە گیرساوە دڵی من**

**یاخۆبەچ داخێکەوە سووتاوە دڵی من**

**تاکۆتایی شیعرەکە ٠٠٠**

**خالّۆ :**

**ناوی (محەممەد)ە ، لەسالّی (١٩٢٨) لەگوندی (نۆڕەباب) لەبناری شارباژێڕ لەدایکبووە٠لەسا لّی (١٩٩٦) کۆچی دوایی کردووە٠**

**نموونەیەك لەشیعرەکانی :**

**"پیاوچاکی بووبەئیرس (میرات)"**

لەکویٚ پیاوچاکی بەبنەماڵەیە

میراتی کۆنی هەزارساڵەیە

جولەکە نەوەی پیٚخەمبەرانە

بەرەی یەعقوبن زۆرچاك بزانە

خەلیل بناسە برابەباشی

باوکی یەکیٚ بووبتی ئەتاشی

نوح بووکوڕەکەی نەبردە (لەگەڵی نەچوو) کەشتی

لەبەرچاویاتۆفان هات کوشتی

تاکۆتایی شیعرەکە ٠٠٠

فەنایی :

ناوی مەلا عەبدوللاٚیە بەئەسڵ خەڵکی شاری سلیٚمانی یە ، بەلاٚم باپیری باوکی لەبەردرو ستبوونی کیٚشەی ناوەخۆیی شاری سلیٚمانی بەجیٚهیٚشتووە و چۆتە دەشتی لاجان لەکورد ستانی ئیٚران ، لەساڵی (١٩٣٢) لەگوندی گەڵوان ی سەربەدەشتی لاجان لەکوردستانی ئیٚران لەدایکبووە٠لەساڵی (٢٠٠٤)کۆچی دوایی کردولەشاری هەولیٚربەخاك سپیٚردرا٠

مەلاتاهیری بەحرکەیی :

ناوی (تاهیر)ە ، عەشیرەتی گەردی یە لەساڵی (١٩٤٥) لەگوندی بەحرکەی ناوچەی بەڕانەتی لەدایکبووە٠

نموونەیەك لەشیعرەکانی :

(شازەلی) نیمە (گەردیمە)

لەبەحریٚ نیم بەحرکیمە

**میرزاخەلیل منەووەری :**

**ناوی محەممەد خەلیل كوڕی خدرمنەووەرە ، منەووەر ناوی دایكی باوكییەتی ، چونكە خا توومنەووەربەخێوی كردووە لەپاشان باوكی شاعیربەخدرمنەووەر ناسراوە ، منەووەربۆتەنا سناوی بنەماڵەكەیان بۆیە شاعیرشانازی پێوەكردووە كردوویەتی بەناسناوی خۆی٠محەممەد خەلیل یەك ناوە وەكو محمدأمین ، ٠٠٠هتد٠**

**نموونەیەك لەشیعرەكانی :**

**لەیلێ گوڵنازەن ٠٠٠لەیلێ گوڵنازەن**

**ئیسم شەریفەش ماچان گوڵنازەن**

**شاعیركچێكی خۆشویستووە ناوی گوڵنازبووە ، بەلاّم بەنسیبی نەبووە٠**

**نموونەیەكی تر :**

**پارە وێڕانلەر جوملە عاف ئۆڵسون**

**پارە وێرمیان قورعە قاف ئۆڵسون**

**واتا ئەوكەسەی پارە بەبەرتیل بدات لەسەربازی عاف دەكرێ ئەوەش بەرتیل نەدات ڕەوانە ی سەربازی دەكرێ٠ ئەم شیعرەی بەتوركی وتووە ، چونكە لەسەردەمی جەنگی یەكەمی جیهانی سوپای عوسمانییەكان بەرامبەربەهێزەكانی ئینگلیز تێكشكان بۆیە هەركەسێكیان بگرتبایە كەمووی ڕیش وئەوانەی ڕەش بوایە دەیانكردە سەرباز بۆیە ناویان ناوە ڕەشبگیری**

**ئەدەب یان مصباح الدیوان :**

**ناوی ڕاستەقینەی عەبدوللاّ بەگە ، لەناوچەی موكریان لەدێی ئەرمەنی بلاخی لە(١٨٦٢) پێی ناوەتە كۆڕی ژیانەوە٠بەنەخۆشی شەپلە لەساڵی (١٩١٢) هەرلەدێیەكەی خۆی كۆچی دوا یی كردووە٠**

**ناتق :**

**ناوی خۆی مەلاكەریمە ، لەساڵی (١٨٦٨) لەشاری سلێمانی هاتۆتە دنیاوە ، لەساڵی (١٩٦٧) كۆ چی دوایی كردووە٠**

کاتب :

ناوی (سلێمان)ەوناسناوی شیعری (کاتب)ە ، لەسلێمانی ژیاوە ، منداڵ بووە باوکی مردووە پا
شان کەوتۆتە لای خاڵی ، پاشان دایك وخاڵیشی کۆچی دوایی دەکەن وەك خۆی دەڵێ : کەو
تمە کۆلآنان وبوومە هاوڕێی هەرچی وپەرچییان لەخوێندن وخوێندەواری دوورکەوتمەوە
وسەرگەردان بووم٠دەچێتە تورکیا ، لەوێ پیاوێك زۆردڵنەوایی دەکات وهانی دەدات بۆنوو
سنی شیعر٠

حەریق :

ناوی (مەلا صالح)ە ، لەساڵی (١٨٥١) لەدێی (زیوی) کەگوندێکە لای سورداش لەدایکبووە٠لە
ساڵی (١٩٠٧) کۆچی دوایی دەکات ولەگۆڕستانی (مەلا جامی) لەسابلاغ دەنێژرێ٠

عەلی باپیرئاغا :

ناوی عەلی کوڕی باپیرئاغایە ، لەقەبی شیعری کەمالی یە ، لەساڵی (١٣٠٥)ی کۆچی لەسلێما
نی لەدایکبووە٠

صابری :

ناوی (شێخ نەجمەددین کوڕی شێخ عەبدولڕەحمانی بەرزنجی)یە ، لەساڵی (١٨٨١)لەدێی شۆ
ریجەی قەرەحەسەن هاتۆتە دنیاوە٠

نموونەیەك لەشیعرەکانی :

(پایزی پیری)

پایزی پیری پەیابوو نەوجەوانیمان نەما

نەوبەهاری عەیشونوشو کامەرانیمان نەما

سامی عەودال :

ناوی حوسەینە ، ساڵی (١٩١٠) لەشارۆچکەی کۆیە لەدایکبووە٠ساڵی (١٩٨٥) کۆچی دوایی کرد

ووه٠

نموونەیەك لەشیعرەكانی :

لەنۆسەت ودەی بووم لەداكی خۆم

لەناوشاری كۆیە بۆیە خەلقی كۆم

بەلاّم دانیشتووی شاری هەولیّرم

لەویّدا دەژیم لەسەررِەنجی خۆم

نموونەیەكی تر :

نەپیّلاّوی تەنگ نەخانەی بەجەنگ

نەهاورِیّ لەگەلّ خواروخیّچ ولەنگ

عەلی بەردەشانی :

لەسالّی (١٧٦٧) لەگوندی بەردەشان لەدایكبووە٠لەسالّی (١٨٠٩) كۆچی دوایی كردووە ، لەگۆرِستانی بەردەشان بەخاك سپیّردراوە٠

نموونەیەك لەشیعرەكانی :

نانی دەستیّنم بەشیری

ناكەم خزمەتی وەزیری

نموونەیەكی تر :

(بەیتی ئەورِەحمان پاشای)

خالق هەرئەتۆم قادری

رِەبی هەرئەتۆم قادری

تاكۆتایی شیعرەكە ٠٠٠

هەوری :

ناوی (عوبیّد شیّخ لەتیف بەرزنجی)یە ، لەسالّی (١٩٤٤) لەگوندی كەلّور ی سەربەناحییەی پردیّ لەدایكبووە٠

نموونەیەك لەشیعرەكانی :

(بوهاربەخێربێی)

بوهاربەخێربێی بەڕاستی جوانی

هەرتۆی كەمایەی خۆشی ژیانی

نموونەیەكی تر :

(وەرزی بوهار)

چەند خۆشە وەرزی بوهار

لابەری خەم وئازار

جیهان وەك بووك ڕازاوە

هەمووی بەگوڵ خەملاوە

نموونەیەكی تر :

(ئەم مۆدەی)

ئەم مۆدەی ئەمڕۆلەم شارە باوە

نیوەی ئەم خەڵكەی لەڕێ لاداوە

ئەوجل وبەرگەی لەبەری دەكەن

ئاگرلەجەرگی لاوان بەردەدەن

هەزاران كەسی لەژین ڕیسواكرد

تووشی ئازارودەردوبەڵاكرد

نموونەیەكی تر :

(سەرچاوەی عیلم وزانست)

سەرچاوەی عیلم وزانست بوو زاتێكی وەك غەزالی

بەئەحیایی علومی دین كەدینی كرد بەعالی

**تاکۆتایی شیعرەکە ٠٠٠**

**پاکی :**

**ناوی (بورهان سەید گوڵ شێخ ئەحمەد کوڕی شێخ فەتاح بەرزنجەیی)یە ، لەساڵی (١٩٥٧) لە گوندی (کرۆژە) لەنزیك شارۆچکەی کۆیە لەدۆڵی سماقولی لەدایکبووە٠**

**دەشتی :**

**ناوی خدرە لەعەشیرەتی نانەکەلی یە ، لەساڵی (١٩٠٩) لەگوندی (مەلاکاغە) لەبناری چیای قەرەچووغ لەدایکبووە٠**

**دلزار :**

**ناوی (ئەحمەد)ە ، لەساڵی (١٩٢٠) لەشارۆچکەی کۆیە لەدایکبووە٠**

**نموونەیەك لەشیعرەکانی :**

**(کارگەران)**

**کارگەرین جەنگاوەرین**

**ڕەنجبەرین تێکۆشەرین**

**بۆقەلای سەرمایەدار**

**تێکدەرین ، تێکدەرین**

**ئێمە ڕۆڵەی شۆڕشین**

**قارەمانی هێرشین**

**بۆسوپای خونخواری خوار**

**قڕکەرین ، دوابڕین**

**تاکۆتایی شیعرەکە ٠٠٠**

نموونەیەکی تر :

(ژن)

ژنی بەد ژان وژەنگی ژیانە

گەرخۆتی لێ دەی ماڵت وێرانە

برای شیرینم جوانی خولق وخوو

بەکاری تۆدێ نەك هی ڕەنگ وڕوو

تاکۆتایی شیعرەکە ...

نموویەکی تر :

(مانگی گوڵان)

مانگی گوڵانە گوڕەی بەهارە

زەمین سەراپاباخ وگوڵزارە

تاکۆتایی شیعرەکە ...

نموونەیەکی تر :

(قسەی پیاوی نامەرد)

ئەگەرپیاوی نامەرد قسەی پێ گوتی

دەزانی وەڵامی چییە ؟ وسکوتی !

نموونەیەکی تر :

(لەدایکبوونم)

هەشتی جەنەوەری

ساڵی هەزارو

نۆسەدوبیست بوو

لەدایکبوونی

دلّزار ، لەشاری

کۆی خۆشەویست بوو

نموونەیەکی دی :

(بۆدەوڵەمەندێکی ڕەزیل)

زگەستووری ورگن بەرازی بەزیو !

هەتاکەی دەنازی بەزێڕوزیو !

بەهارت بەسەرچووڕەزیلی رزیو

ژیانت لەدەست چوو بەرەوگۆڕخزیو

لەبۆکات وڕۆژانی پڕتەنگەبەر

شتێکی بەکەڵکت نەچاند بێتەبەر

نموونەیەکی تر :

(خۆت هەڵمەکێشە)

ئەگەرجوامێری وپەسندە کارت

خۆت هەڵمەکێشە بەکەس وکارت

تاکۆتایی شیعرەکە ...

(سوکی)

لای پیاوی نامەرد سووکی ئاسانە

برینی لەشی مردووبێ ژانە !

(ڕەوتی ژیان)

کێ بووهەتاسەرژیابەشادی بەئارەزووی دڵ ؟

سەدان ، هەزاران ، ئاوات وخۆزگەی نەبردە بن گڵ ؟!

نموونەیەکی تر :

(ماوەی ژیان)

ئەسپی ڕەش وسپی زەمان

**هەڵمان دەگرێ بەرەونەمان**

**بێوەی :**

**ناوی (شێخ ئەمین)ە ، لەساڵی (١٩٣١) لەبنەماڵەی شێخ عەلائەددینی بیارە هاتۆتە دنیاوە٠**

**نموونەیەك لەشیعرەكانی :**

**(بۆهاوڕێی شكارم)**

**هەرچەندە باوی وەفانەماوە**

**لەم زەمانەدا بێ شەرتی باوە**

**بەڵام من یادی ئێوە هەردەكەم**

**هەرشوێنێ خۆش بێ ناوێكتان ئەبەم**

**سەفوەت :**

**ناوی (مستەفاكوڕی حاجی مەلاڕەسوڵی دێلێژە)یە ، لەساڵی (١٩١٠) لەگەڕەكی دەرگەزێنی شار ی سلێمانی لەدایكبووە ، لەساڵی (١٩٦٣) كۆچی دوایی كردووە٠**

**نموونەیەك لەشیعرەكانی :**

**جیهان وەك سینەماوایە هەمووڕۆژێ لەسەد ڕەنگە**

**لەخۆت بایی مەبە بەم ڕەنگە ، گۆڕ گۆڕخانەیی تەنگە**

**ئەوەی وادێتە دنیا شینی بۆبكەن چاترە لای من**

**چییە ئەم چەپڵە ڕێزانە ، چییە ئەم شایی وئاهەنگە**

**نموونەیەكی تر :**

**(سەلام)**

**سەلام لەسەرتۆیاڕەسوللاّ**

**سەلام لەسەرتۆیاحەبیبوللاّ**

**سەلام لەسەرتۆ یانەبی ڕەحمەت**

**سەلام لەسەرتۆ شافیعی ئوممەت**

**تاكۆتایی موناجاتەكە ٠٠٠**

بێ دڵ :

ناوی مەلا عەبدوڵڵایە ، لەساڵی (١٩٢٦) لەگوندی قەپلانی سەربەناوچەی کەندیناوە لەدا یکبووە٠لەساڵی (١٩٨٦) ماڵئاوایی لەدنیاکردو لەگۆڕستانی شێخ ئەحمەد بەخاك سپێردرا٠

نموونەیەك لەشیعرەکانی :

(کتێب)

ئەی کتێبی ڕەنگینم

ڕووناکی ڕووی زەمینم

ئەگەرڕۆژێ نەتبینم

پەریشان وغەمگینم

هاوڕێیەکی زۆرچاکی

چەند دڵسۆزودەستپاکی

تاکۆتایی شیعرەکە ٠٠٠

موفتی پێنجوینی :

ناوی (مەلاعەبدوڵڵا)یە ، لەساڵی (١٨٨١) لەدێی بیستانە لەناوچەی پێنجوین لەدایکبووە٠ لەساڵی (١٩٥٢) لەنەخۆشخانەی سلێمانی کۆچی دوایی کردوتەرمەکەیان بردەوە پێنجوین و لەوێ ناشتیان٠

نموونەیەك لەشیعرەکانی :

(گەورەیەك)

گەورەیەك بۆکەس نەبێ سێبەری

خۆم بۆبگێڕم لەدەوری سەری

بەوشکی بۆچی ببمە مەیتەری

وەختێ دەرکەوێ هەستم لەبەری

تاکۆتایی شیعرەکە ٠٠٠

نموونەیەکی تر :

(خوێندنی کچ)

جاران ئەیانووت لەزەمانی زوو

گەرکچ بخوێنی زووئەبێ بەدخوو

بەهۆی نووسینی نامەی پەنهانی

دێنێتە بەرهەم سەد دۆستی گیانی

تاکۆتایی شیعرەکە ٠٠٠

ڕازی :

ناوی (صابر)ە ، لەساڵی (١٩٣٧) لەشاری سلێمانی لەگەڕەکی مەلکەندی هاتۆتە دنیاوە٠

نموونەیەك لەشیعرەکانی :

(نەورۆز)

نەورۆزکەژاوەی بەهاری هانی

بووکی بەهاریش ڕازاوەی جوانی

نموونەیەکی دی :

(ناز)

بەچاوی پڕلەغەمزەی وادیارە

ئەشێوێنێ عەزیزم ئەم دیارە

لەسێ وەرزی ژیان بێ بەشم من

بولبول ئاساوەرزم تەنیابەهارە

بەئازاروپەریشان وحەزینم

تەماشای ڕەنگی زەردم کەن دیارە

دیاری نادیارم بێ دیارت

کپ وبێ دەنگە بەوێنەی (مغارە)

بەپێچی پڕلەپێچی پرچی لوولت

هەزاران دڵ دراوە لەقەنارە

تاكۆتایی شیعرەكە ۰۰۰

میهری :

ناوی (محەممەدشەریف)ە ، لەساڵی (۱۹۰۹) لەشاری هەولێرلەدایكبووە ، لەساڵی (۱۹٤۲) كۆچی دوایی كردووەولەگۆڕستانی شیخ الله نێژراوە۰

نموونەیەك لەشیعرەكانی :

لەئەهلی ئەم زەمانە نەم دیوە عەهدوپەیمان

نەم دیوە ئیشی باش ونەم دیوە ئەمن وئەمان

تاكۆتایی شیعرەكە ۰۰۰

ئەختەر :

ناوی (ئەمین ئاغای حاجی بەكرئاغای حەوێزی)یە ، لەساڵی (۱۸۳۸) لەكۆیەلەدایكبووە ، لە (۱۸۸۸) كۆچی دوایی كردووە۰

هێمنی موكریانی :

نموونەیەك لەشیعرەكانی :

(تۆم هەرلەبیرە)

لەشایی دا لەوەختی هەڵپەڕینا

لەخۆشی دا لەكاتی پێكەنینا

لەكۆڕی ماتەم وگریان وشینا

ئەمن ئەی نیشتیمان تۆم هەرلەبیرە

تاكۆتایی شیعرەكە ۰۰۰

نموونەیەكی تر :

عەزیزم بۆچی تۆراوی لەخۆڕا ؟

چی قەوماوە ؟ دڵی تۆبۆچی گۆڕا ؟

**بێ بەش :**

**ناوی (مەلامەسعود)ە ، لەساڵی (١٩٣٢) لەشاری هەولێرلەدایکبووە ، کوڕی حاجی مەلاعەبدو للأی شەنەغەیی یە ، باوك وباپیری لەخێلی شوانن٠**

**نموونەیەك لەشیعرەکانی :**

**(حەق وناحەق)**

**حەق وناحەق بەجارێ تێکەلأوە**

**ئەگەرڕاستیت دەوێ ڕاستی نەماوە**

**تاکۆتایی شیعرەکە ٠٠٠**

**دڵساف پشدەری :**

**ناوی (مەلامحەممەد)ە ، لەساڵی (١٩٣٣) لەگوندی (ئەشکەنە) لەناوچەی پشدەر لەدایکبووە٠ لەساڵی (٢٠٠٢) بەنەخۆشی (ڕەبۆ) کۆچی دوایی کردووە٠**

**نموونەیەك لەشیعرەکانی :**

**بەهارچەند خۆشە دیمەنی جوانە**

**پڕە لەگوڵ ولالە و ڕەیحانە**

**تاکۆتایی شیعرەکە ٠٠٠**

**نموونەیەکی تر :**

**بابگەڕێتەوە هیواوئاواتم**

**بژێنێتەوە ڕەگی حەیاتم**

**ئەگەرئاواتم بگەڕێتەوە**

**ڕەگی حەیاتم ئەژێنێتەوە**

**تاکۆتایی شیعرەکە ٠٠٠**

**نموونەیەکی تر :**

**(پارچە هەڵبەستێك بۆگەنجان)    (١٩٨٨)**

**ئەگەرتۆوەدوای کچی خەڵك کەوی**

**کوڕێکیش ئەبی دوای خوشکت کەوی**

**بیربکەوە بۆوابێ باکی**

**خۆشت خاوەن بەخوشك ودایکی**

**(ع٠ع٠شەونم) :**

**ناوی (عەلی عەبدوڵلاً)یە ، لەساڵی (١٩٢٥) لەشاری هەڵەبجە لەدایکبووە٠مامۆستای سەرەتایی بووە چەند بەرهەمێکی بۆمنداڵان نووسیووە٠**

**نموونەیەك لەشیعرەکانی :**

**(بەبە)**

**بەبە بەبە بچکۆڵە**

**مەگری مەگری بەرخۆڵە**

**بنوولەناوجۆلانە**

**گەرم وگوڕە هێلانە**

**دایە دەست گیراوە**

**منی لای تۆداناوە**

**منیش هەرچەن منالّم**

**خەریکی ئیشی مالّم**

**هانێ مووروواخرخاڵ**

**هابابەتی گڕوگاڵ**

**بەبە پێبکەنە ، ژیربە**

**بەس چاوەڕوانی شیربە**

**لەم شیعرەدا کچانی کورد فێردەکات ئاگاداری بەبەبچووکەکانی خانەوادەکەیان بن ویارمەتی دایکیان بدەن لەکاتی پێویست دا٠**

مەدحەت بێ خەو :

ناوی (مەدحەت خدر)ە ، لەساڵی (١٩٣٤) لەشارۆچکەی مەخموورلەدایکبووە٠لەهۆزی(سیان)ە

عەزیزی مەلاڕەش :

ناوی (عەزیزمەلائەحمەدڕەحیم)ە ، لەساڵی (١٩٣٦)لەگوندی (چەغەمیرە)ی ناوچەی کەندینا وەلەدایکبووە٠دەرچووی حوجرەی مەلایانەولەساڵی (١٩٦٠) بۆتە مامۆستای سەرەتایی ، تاخا نەنشین کردنی مامۆستابووە٠کۆمەڵێك بەرهەمی هەیە وەك: پشیلۆکە (شیعر) ، گورگ وبز ن (ڕۆمان) ، تۆبەی گورگ مەرگە (چیرۆك) ، ٠٠٠هتد٠

لەتیف هەڵمەت :

ناوی (لەتیف مەحموودمحەممەد حەسەن)ە ، لەساڵی (١٩٤٧) لەشارۆچکەی کفری لەدایکبووە

نموونەیەك لەشیعرەکانی :

ئای لەم بەفرە باریووە

زەوی یەك پارچە زیوە

هیوا تۆپەڵێ توخڕکە

گوێی ڕزگاری پێ سڕکە

## زانیاری گشتی :

**★جاکارتا :**

ئەوشارە پایتەختی ئەندەنوسیایە (١٨) هەژدە ملیۆن کەسی تێدادەژی٠

**★ڤیەننا :**

پایتەختی نەمسایە ، ژمارەی دانیشتوانەکەی ملیۆنێك کەسەو ٤٧٪ی سەوزاییەو شارێکی پا ك وهێمن ودلگیرە٠لەبارەی ناوەکەی دەوترێت ناوەلاتینییەکەی (ڤندوبوونا) بووە ، بۆچوو نێکی تردەڵێ : ئەم ناوە دەگەڕێتەوە بۆفەرمانڕەوایەك ، کەلەکۆن دا لەوناوچەیەدا ژیاوە بە ناوی (ڤینبس) ، هەروەها دەگێڕنەوە ڤیەننا ناوی پێشووی خێزانی پاشای نەمسایە٠

**★پردی دەلال :**

پردی دەلال یەکێکەلەشوێنەوارە دێرینەکان لەڕووی مێژووییەوە ساغ نەبۆتەوە ، کەمێژووە کەی بۆکەی دەگەڕێتەوە٠ئەم پردە دەکەوێتە شارۆچکەی زاخۆ سەربەپارێزگای دهۆکە ، در یژی پردەکە (١١٤)م وپانییەکەی (٧،٤)م وبەرزییەکەی (٥،١٥)مەترە٠ئەم پردە لەپێنج کەوان (قەوس) پێکدێ ، کەوانی ناوەڕاستیان لەوانی ترگەورەترە ، سەبارەت بەناوەکەی دەڵێن ئەم پردە زۆرجوان وسەرنجڕاکێشە بۆیە پێیان وتووە دەلال٠

**★فیزیا :**

وشەی فیزیالەوشەی (فیزیك)ی یۆنانییەوە هاتووە ، کەبەنای (سروشت)دێت٠(ئەوئامێرانە ی ، کەمرۆڤ دروستیان دەکات هەمووی لاسایی بوونەوەرەکانی خوای پەروەردگارن بۆنموونە لەدروستکردنی تەلەفۆن لاسایی گوێی ئادەمیزادکراوەتەوە ، فڕۆکە لاسایی باڵندە کراوەتەوە ، ڕادار لەسەرشەمشەمەکوێرە دروستکراوە٠)

**★ناسا :**

واتائاژانسی ئاسمانی ئەمریکی٠

**★لێزەر :**

وشەی لێزەربریتییە لەپیتی یەکەمی چەند وشەیەك ، کورتکراوەی ئەم ڕستەیەیە (بەهێز کردنی ڕووناکی بەهۆی کاراکردنی دەردانی تیشکی کارۆموگناتیسی)٠یەکەم ئامێری (لێزەر) لەساڵی (١٩٦٠) لەلایەن زانا (میمان) دروستکرا٠لێزەرلەبواری پزیشکی دا بەفراوانی بەکارد

یت لەچارەسەرکردن ونەشتەرگەری وددانسازی وچارەسەری چاو ، هەروەها لە بواری پیشە
سازی دا وەك لەحیم وتاواندنەوەوبەهەڵمکردن ، هەروەهالەبواری سەربازی دەستنیشانکرد
نی رێڕەوی مووشەك و٠٠٠هتد٠

★کیمیا :

کیمیالەوشەی (المتكمی) واتاداپۆشراو ، چونکە کیمیاگەرەپێشووەکان زانیارییەکانی خۆیان
بەنهێنی دانابوو لەخەڵکییان دەشاردەوە٠

★زیو :

زیوبەئینگلیزی (سیلڤەر) ، یەکێکەلەتوخمەکیمیاییەکان وهێمای (ئەی جی)یە کەکورتکراوە
ی وشەی (ئەرجەنتین)ە ، چونکە ئەرجەنتین برێکی زۆری زیوی لێ دۆزراوەتەوە٠

★ئەڵماس :

ماددەیەکەزۆرجارشێوەی شەش پالوی هەیە٠یۆنانییەکان بە(ئەڵماس)یان دەوت : (ئاژماس)
، کەمانای ناتوانرێ بگۆڕدرێ ، چونکە زۆرڕەقە٠"ئیبن مەنزوور"لە(لسان العرب) دەڵێ : لە
بنچینەدا وشەی ئەڵماس لەوشەی (ئاژماس)ی یۆنانییەوە وەرگیراوە وکراوەتەعەرەبی پاشان
عەرەبەکان (ژ)یان گۆڕیوە بۆ(ل) ، چونکە زۆرلێك نزیکن لەشێوەودەرچوون لەدەم٠ کانەکا
نی ئەڵماس بەزۆری دەکەونە ناوەڕاست وباشووری ئەفریقیا ، برێکی باشیش لەکەنەدا و ڕو
سیاو بەڕازیل وئوستوڕالیادۆزراراوەتەوە٠

★جیۆلۆجیا :

زانستی دروستبوون وپێکهاتنی زەوی ، باس لەچۆنییەتی دروستبوونی زەوی دەکات لەبوارە
کانی بەردوتوێکڵی زەوی٠

تەجوید :

زانستی جوان خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز بەئامانجی هەڵەنەکردن لەخوێندنەوەیدا٠بۆنموو
نە پیتی (ل) لەم وشانە ناخوێندرێتەوە : (السماء ، والشمس ، ولاالضالین ، ٠٠٠الخ)٠
خوای گەورە فەرموویەتی:{٠٠ورتل القران ترتیلا} المزمل : ٤ واتا : ((دەوری قورئان بکەرەو
ەوە بەوردی ولەسەرخۆ))٠

**ياخود ياساى خوێندنەوەى پيتەكان :**

**حم : حا – ميم**

طسم : طا - سين - ميم

ن : نون

طس : طا – سين

الم : اليف – لام – ميم

ق : قاف

المص : اليف – لام – ميم – صاد

الر : اليف – لام – را

كهيعص : كاف – ها – يا- **عەين – صاد**

**يس : يا – سين**

**المر : اليف – لام ميم – ڕا**

طه : طا – ها

**٭بەيروت :**

**دلگيرترين ناوچەى لوبنان بەيروتە ، كەپايتەخت وگەورەترين شارى ولأتەكەيە زياترلەدوو مليۆن كەس تێيدا نيشتەجىٚ يە٠دانيشتوانى بەيروت بەسەرچەندين پێكهاتە دابەشبوون : سوننە ، شيعە ، مەسيحى٠ ٤٥٪ سوننە ، ١٦٪ شيعە ، ٣٩٪مەسيحى٠سەبارەت بەناوەكەى مێژ ونوسان دەڵێن ناوى بەيروت لەوشەى (بيرۆتا)ى ئارامييەوە هاتووە بەماناى (سنەوبەر) ، هەشيانە دەڵێ : لەوشەى** (بيئروت) **ى عيبرييەوە هاتووە ، كەكۆى (بير)ە٠**

**٭ئەمستردام :**

**گرينگترين شارى هۆڵەندايە ودانيشتوانەكەى يەك مليۆن كەسە وناوەكەشى لەڕووبارى (ئە مستل) هاتووە٠**

**٭ئەسكيبۆس :**

**خوداى پزيشكى لاى گريكەكان٠**

**٭ديۆنيسيۆس :**

**خوداى مەى لاى گريكەكان٠**

★ئەپۆلۆ :

خودای شیعرومۆسیقاوجوانی پیاوان لای گریکەکان٠

★کریمینۆلۆژی (تاواناسی) :

ئەوزانستەیە ، کەلەبنچینەوهۆکارەکانی تاوان وشێوازی بەرەنگاربوونەوەی تاوان دەکۆڵێتەو ەo

★زێڕ :

بەمانای زەرد دێت ، لەبەرئەوەی ڕەنگی زەردە٠زێڕبەتەنیاهیچی لێ دروست ناکرێت چونکە زۆرنەرمە بۆیەتێکەڵ بەکانزای دیکەی ڕەق دەکرێت ئەم تێکەڵکردنە بەڕێژەی یەك بۆهەژ دەیان یەك بۆبیست وچوار تێکەڵکراوە ، کەئەمرۆلەبازاڕبە(عەیار)ناسراوە٠واتائەگەربڕی ز ێڕێك بکرێ بەبیست وچواربەشەوە سێ بەشی لەکانزایەکی دیکەی وەك مس پێکهاتبێ ئەوە عەیاری ئەوزێڕە بیست ویەکە ، عەیاری نۆ کەتەنیانۆبەشی لەبیست وچواربەشەکە زێڕە پا نزەبەشی کانزای دیکەیە٠

★بی ئێم دەبلیوو :

ئەم سێ پیتە پیتی یەکەمی سێ وشەیە واتا (کارگەی بایەرمیونشن) کەشارێکی ئەڵمانییە نا سناوی ئەم ئۆتۆمبیلە هی ئەم شارەیە٠ئەم کۆمپانیایە بەتەنیائۆتۆمبیل دروست ناکات ، بە ڵکوماتۆڕسکیل وپایسکیل وتیشێرت وجانتاوسەعات ومەدالیاوجل وبەرگ وپێڵاویش دروست دەکات٠

★بەیبوون :

ئەم گوڵە پەڕەکانی سپی یە وناوەکەشی زەردەوبۆنی لەبۆنی بەهێ دەچێت بۆیە پێی دەڵێن بەیبوون لە(بەهێ + بۆن)هاتووە٠

★ئێچ دی :

بەواتای زۆرڕوون دێت پیتی یەکەمی دووشەیە٠

★سیرامیك :

لەوشەی (کیرامۆس)ی یۆنانییەوەوەرگیراوە ، کەبەمانای (ماددەسووتاوەکە)دێ٠

**★ڕووباری خاپور :**

**ئەم ڕووبارە لەکوردستانی تورکیاهەلدەقوولیٚ وبەشارۆچکەی زاخۆتیٚدەپەڕیٚ لەفیشخاپوردە ڕژیٚتەدیجلەوە٠**

**★زیٚی گەورە :**

**ئەم ڕووبارە لەشاخەکانی نیٚوان دەریاچەی وان ودەریاچەی ورمیٚ هەڵدەقوولیٚ٠**

**★زیٚی بچووك :**

**ئەم ڕووبارە لەناوچە شاخاوییەکانی سنوری عیراق وئیٚران هەلدەقوولیٚ٠**

**★ڕووباری عوزیٚم :**

**ئەم ڕووبارە لەنیٚوان زیٚی بچووك وڕووباری دیالە هەڵدەقوولیٚ٠**

**★ڕووباری سیروان :**

**لقی سەرەکی ڕووباری دیالەیە لەناوسنوری کوردستانی ئیٚران هەلدەقوولیٚ٠**

**★ڕووباری ئەلوەند :**

**ئەم ڕووبارە لەئیٚران هەڵدەڕژیٚ ، دواترشاری خانەقین دەبڕیٚ ولەباکوری شاری جەلەولا دەڕ ژیٚتەدیجلەوە٠**

**★گالاٚکسی :**

**واتامەجەڕە ، مەجەڕەش بریتییە لەچەندسەدهەزارملیۆن ئەستیٚرە٠**

**★فهرلەباپیرانی پیٚخەمبەرە (درودی خوای لەسەربیٚ) ، ناوی قورەیش بوو عەشیرەتی قورە یش ناوی خۆی لەوییەوەوەرگرتووە٠واتائەوەی لەسەرەوەی ئەوەپیٚی ناوتریٚ قورەیش ، بە ڵکوپیٚی دەوتریٚ (کنانی)٠(کلاب)یش ، کەناوی خۆی (حکیم)یانیش (عوروە)بووە لەبەرئە وەی زۆرڕاوی بەسەگ دەکرد بۆیەئەم ناسناوەی لیٚنراوە٠قوصەی ئەویش یەکیٚکە لە باپیرا نی پیٚخەمبەر(درودی خوای لەسەربیٚ) ناوەڕاستەقینەکەی (زەید)ە٠هاشم لەبەرنان بدەیی وسەخاوەتی ئەم ناسناوەی لیٚنراوە ناوی خۆی (عمروکوڕی عبدمناف)ە ، کەتیرەی هاشمی ناوی خۆی لەوی وەرگرتووە٠(عەبدولموتەلليب)یش ناوی خۆی (شیبة الحمد)ە٠**

★ڕێختەر :
ئامێرێکەبەکاردەهێنرێت بۆپێوانەکردنی پلەکانی بوومەلەرزە٠بۆیەکەمجارلەلایەن (چارلزڕ یشتر)لەساڵی (١٩٣٥)دا دروستکراوە٠

★جەوهەر :
بۆنموونە جەستەی مرۆڤ جەوهەرە ، بەلاٌم سوورەیان سپی یە یان ڕەشە جەوهەرنییە٠
★ناعور :
چەرخێکەئاوسەردەخات ودەنگی لێوەدێت بۆیەبەناعورناونراوە لەبەرئەودەنگەی لێوەی دە بیسترێت ، هەروەك لەزمانی عەرەبی دا دەوترێت : (أمرأة نعارة) واتا : (ژنێکی هاواروقیژ ەکار)٠
★براهمە :
تایەفەیەکن لەولاٌتی هیند دەگەڕێنەوە بۆسەرگەورەکەیان ، کەناوی (براهم)بووە٠
★بوومەلەرزە :
بوومەلەرزە دیاردەیەکە لەئەنجامی خێرالەرینەوەی زەوی دروست دەبیٚ ، ئەگەرپلەکە لە ١ – ٤ بوو ئەواهیچ زیانێکی نابێت تەنیاهەستی پێدەکرێت ئەگەر پلەکە لە ٤ – ٦ بوو بوو مەلەرزەی ناوەندی پێدەڵێن تەنیازیان بەخانوو شوێنی نیشتەجێبوون دەگەیەنێت ، بەلاٌم ئەگەرپلەکە لە ٧ – ١٠ بوو دەبێتە هۆی لەناوچوون وتەنانەت زیانی بۆشارەکانی نزیکیش د ەبێت٠

★لەفەرموودەیەکدا ، کەئیمامی بوخاری وموسلیم ڕیوایەتیان کردووە هاتووە لەئەبوهوڕەیر ەوە ، کەپێخەمبەر(درودی خوای لەسەربیٚ) فەرموویەتی : (اذاجاء رمضان فتحت أبواب الجنة وغلقت أبواب الناروصفدت الشياطين) واتا : (کاتێك ڕەمەزان دێت ، دەروازەکانی بەهەشت دەکرێنەوەودەرگاکانی دۆزەخ دادەخرێن ، شەیتانەکان پەلبەست دەکرێن ودەبە سترێنەوە)٠ڕەنگەهەندێك کەس بپرسن ئەگەرشەیتانەکان دەبەسترێنەوە بۆچی کۆتایی بە

ئەنجامدانی تاوان نایەت لەم مانگەدا ؟ لەقورئانی پیرۆزدا ئاماژەبەدووجۆرە شەیتان کراوە : (انس ، جن){شياطين الانس والجن}الانعام : ١١٢ لەناوکوردیش وتراوە : (شەیتانی بەشەری بەشەرە) مەبەست لەفەرموودەکەشەیتانی جنە ، هەروەهامەرج نییەهەرکەسێك بەرۆژووبوومەرجەکانی رۆژووی پاراستبێ.

★ئلوهییەت : لە (اله)هاتووە مانای خوایەتی ، کەئەمرونەهی لەخۆوە دەگرێت ، پەرستن لە خوەوەدەگرێت بەم شێوازەخودای تەعالادەفەرموێت :{وماخلقت الجن والانس الاليعبدون} تەماشادەکەین لەم زەمەنە لەهەندێ ولآت بت (صنم) دەپەرسترێ ، بت کەلەبەرد دروست دەکرێ دەبێ بکرێ بەبەردی دیوار.

★ڕبوبییەت : (رب) ، کەخودا (رب)ە بەمانای خاوەن ، (رب)لەئەسڵدا چاوگە بەمانای بەخێو کردن ، خێولەزمانی کوردی دا واتا (خاوەن) ، کەخودا (جل جلاله) خاوەنی ئینسان وگشت بوونەوەرە.لەسەرەتای سورەتی (فاتیحە)دا هاتووە : (الحمدللهرب العالمين) ، کەواتەخوای پە روەردگاربەخێوکەر(ڕازق)وخاوەنی هەمووجیهانیانە.

★لەشارۆچکەی کۆیە یەکەم کچ چووبێتە قوتابخانە ، نەجیبەی کچی مەلای گەورەی کۆیە بووە.

★تەلاقی (خلعی) :

بریتی یەلەتەلاقدانی ژن بەرامبەربەشتێکی دیاریکراو بەومانایە ژنەکەبەمێردەکەی دەڵێ یان باوك وبراوخزمی ژنەکەبەمێردی ژنەکەدەڵێن : ژنەکەتەلاق بدە بەوئەندازەپارەیە یا خودمێردبەژنەکەدەڵێ : ئەگەرلەمارەییەکەم ئازادم بکەی منیش تەلاقت دەدەم.

★تەلاقی تەعلیقی (هەڵواسراو) :

بریتی یەلەوەی پیاوەکە تەلاق کەوتنەکەی بەئەگەرێك یانیش مەرجێك دەبەستێتەوە وەك بەخێزانەکەی دەڵێت : تەلاقم بکەوێت ئەگەرخێزانم بچێت بۆماڵی فلآنەکەس یان ئەوکارە بکات وێنەی ئەم تەلاقانەش زۆرن.

★سەربازی نەناسراو (جندی مجهول) :
بریتییەلەوەی کەسێك کارێکی چاکی ئەنجام داوە نەیویستووە خەڵك بیزانێت٠کاتێك فەڕە
نساله ١١ /١١/١٩٢٠ یادی تێپەڕبوونی دووساڵ بەسەرکۆتایی هاتنی یەکەم جەنگی جیهانی کر
دەوە ، وەزیری بەرگری فەڕەنسا (مسیۆماجینۆ) داوای لەیەکێ لەکەرتەکانی سوپاکرد تەر
می هەشت سەربازی فەڕەنسی نەناسراو لەوانەی لەجەنگی (فەردان) سەربازەکانیان لەوێ
ڕیزبوون تاوەکوسلاّوی سەربازی لەوتەرمانە بکەن ، ماجینۆبەخۆی ئامادەبوو بچوکترین
سەربازی خۆبەخشی دەست نیشان کرد وتاجەگوڵینەیەکی دایەدەست بۆئەوەی بەکەیفی
خۆی لەسەریەکێ لەتابووتەکان دابنرێ پێی وت : ئەوتەرمەی تاجەگوڵینەکەی لەسەردادە
نێیت بۆهەتاهەتایە دەبێتەتەرمی (سەربازی ون) واتادەبێتەنیشانەی پاڵەوانێتی یەك ملیۆ
ن ونیوسەربازی فەڕەنسی کەگیانی خۆیان لەپێناوی نیشتیمان بەخت کرد٠
★کتێبی گینس :
ئەوکتێبەهەمووژمارە پێوانەییەکان لەناوخۆی تۆماردەکات ، هەرشتێ پاشگری ترین ی پێو
ەبێ دەچێتەناوئەوکتێبە٠
★مرواری (لؤلؤ) :
مرواری جۆرێکیان هەیەسروشتی یە لەبنی زەریاودەریاکان دەدۆزرێتەوە ، جۆرەکەی تری د
ەستکردە ئەمەیان مرواری ڕاستەقینەنییە ، بەڵکومادەیەکی شووشەیی لووسە بۆجوانی وڕا
زاندنەوەبەکاردێت ونرخیشی هەرزانە٠مرواری لەڕووی ڕەنگەوە چەندجۆرێکی هەیە وەك :
سپی ، ڕەش ، پەمەیی ، زەرد٠بەلاّم سپییەکەیان بەهادارترین جۆری مروارییە٠
★گیوموکریانی :
ناوی (عبدالرحمن)ە لەساڵی (١٩٠٣)لەشاری مەهاباد لەدایکبووە٠لەساڵی (١٩٢٥) چاپخانەی زا
ری کرمانجی دامەزراندووە ، لەساڵی (١٩٥٤)گۆڤاری هەتاوی دەرکردووە وخۆی خاوەن ئیمتیا
زوسەرنوسەری بووە ، لەساڵی (١٩٧٧) لەنەخۆشخانەی موسڵ کۆچی دوایی کردولەگۆڕستانی
(ئیمام محەممەد)لەشاری هەولێربەخاك سپێردرا٠
★ئەمپێرلەچییەوەهاتووە ؟
ئەمپێرفیزیاناسێکی فەڕەنسی بوو تەزووی کارەبا بەناوی ئەوەوە ناونراوە لەساڵی (١٨٣٦)کۆ

چی دوایی کرد داهێنەرێکی گەورەی بواری کارەبابوو٠

⋆هەرتەل :

گوندێکەکەوتۆتە ڕۆژئاوای بێتواتە سەربەناوچەی خۆشناوەتی٠هەرتەل مێژوێکی کۆنی هه یە ، لەبارەی ناوی هەرتەل دەڵێن لەناوی پیاوێك وەرگیراوە کەناوی (هەرتائیلا)بووە٠

⋆وشەی ئۆکەی لەچییەوە هاتووە ؟

ئۆکەی وشەیەکە بۆڕەزامەندی دەربڕین بەکاردێ شوێنی دروستبوونی ئەم وشەیە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە پیتی یەکەمی (ئۆڵدکیندەر)ە ئەمەش ناوی خوازراوی (مارتن فا ن بودین)ە ئەم پیاوە چۆتەوە بۆشارەکەی خۆی (ئۆڵدکیندەرهوك) کەشارێکی ئەمریکایە٠

⋆ئۆتۆمبێلی فۆرد لەچییەوە هاتووە ؟

"هێنری فۆرد" لەساڵی (١٨٦٢) لەویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکالەدایکبووە ، دامەزرێنەر ی کۆمپانیای (فۆرد)ی ئۆتۆمبێل دروستکردن بووە٠

⋆ئیبن سینا :

زانایەکی پزیشکی بوو لەساڵی (٩٨٠) ی میلادی لە گوندێکی نزیك بە شاری بوخارای ئۆزبا کستان لەدایکبووە لەساڵی (١٠٣٧) ی میلادی لەتەمەنی (٥٧) ساڵی دا کۆچی دوایی کردووە٠

⋆بێستوون :

لەفارسی کۆن دا (بغستان) یان (بگستان) یان پیٚ وەتووە بەدوو واتا لێکدراوەتەوە :

١ – باغستان

٢ – شوێنی خوداکان

ئاغجەلەر :

شارۆچکەیەکی کۆنە ویەکێکە لەناحیەکانی قەزای چەمچەماڵ وبیست وچوارکیلۆمەترلێی دوورە ، دەکەوێتەباکوری ڕۆژهەلاٚتی چەمچەماڵ٠ناوی ئاغجەلەربەتورکی واتا (دارستان) نا وچەیەکی سەوزی کشتوکاڵی بووە٠

⋆ئۆرکیسترا :

بریتییە لەکۆمەڵێك میوزیکژەن و ئامێری هەمەجۆری مۆسیقا زۆرجارژمارەیان دەگاتە نز یکەی (١٠٠) سەد میوزیکژەنی ئامێری هەمەجۆر٠

★ڕادار :

وشەی ڕادارپیتی یەکەمی سێ وشەیە کەبەمانای (کەشف ومەودا دیاریکردن بەڕادیۆ) ، ڕادار یەکێکە لەودەزگایانەی کەبۆدیاریکردنی شوێن وئاڕاستەی خێرایی جولەکەرەکانی وەك فڕۆ کەوکەشتی وئۆتۆمبێل ، هەروەها بۆمەبەستی زانینی باری کەش وئاووهەوا و٠٠٠هتد٠

★خاوەن پێداویستییەتایبەتییەکان :

بەوکەسانەدەوترێ کەنەقوستانییەکیان هەیە لەڕووی جەستەوەبێت یان دەروونی٠ئەم نە خۆشیانەش هەندێ جارهۆکارەکەی بۆماوەییەیان زکماکە هەندێ جاریش لەئەنجامی ڕوو داوێکەوە هاتووە٠

★بێتووشی :

یەکێکەلەگوندەکانی دەڤەری ئالآنی سەربەشاری سەردەشت لەکوردستانی ئێران٠

★کافکا (١٨٨٣ — ١٩٢٤) : نوسەرێکی چیکی بەئاین جولەکەیە٠

★فرچك :

بەویەکەم چۆڕە شیرەدەوترێ کەبەرخی ساوای لەدایکبوو لەگوانی دایکییەوە دەیمژێ٠

★پەرێز : بەوپارچە گەنم وجۆیە دووراوە دەوترێ کەپاشماوەکەی لێ بەجێماوە مەڕدارەکان مەڕی تێدەکەن٠

★تاگور :

ئەم ئەدیبە لەولآتی هیند لەبەشی بەنگال لەسالّی (١٨٦١) لەدایکبووە٠

★ڕۆمانی تەڕەزانی مەیموون :

ئەم ڕۆمانە لەنوسینی نوسەری ئەمریکا (ئیدگارڕایس بورۆس)ە (١٧٨٥ — ١٩٥٠) ئەوڕۆمانە سەرکەوتنی گەورەی بەدەست هێنا ، چونکە کرایە فیلم وکتێبی مندالآن ولەیاری مندالآن و جل وبەرگ دەرکەوت٠

٭گردی سەیوان :

ناوی قەبرستانێکە لەسلێمانی لەبارەی ناوەکەیەوە دووبۆچوون هەیە :-

یەکەمیان پێی وایە کەلەچادر یاخود چەترودەوارەوە هاتووە لەبەرئەوەی کاتی خۆی میرەکا نی بابان چادرودەواریان تیاهەڵداوە٠دووەمیان پێی وایە کەلەسێوان هاتووە بەومانایەی کەد اری سێوی زۆری لێ بووە ، گردی سەیوان کۆمەڵێك شاعیروناوداری لێ نێژراوە لەوانە : سالم وکوردی وسلێمان پاشای بابان وشێخ مارفی نۆدێ وئەمین زەکی بەگ وحەپسەخانی نەقیب وڕەفیق حیلمی وکاکەی فەللاح ودیلان وهەردی و٠٠٠هتد٠

٭خۆران :

گوندی خۆران دەکەوێتەبناری چیای سەفین لەناوچەی خۆشناوەتی سەربەناحییەی سەلا حەددینە سەربەقەزای شەقلاوە٠لەبارەی ناوەکەی چەندبۆچوونێك هەیە ، یەکەمیان دە لێ : لەوشەی (خۆر(ڕۆژ) + ان) پێکهاتووە کەدەگەڕێتەوە بۆپیرۆزی خۆرلەئاینی زەردەشتی دووەمیان پێی وایە دەگەڕێتەوە بۆ(باباخۆران) کەپیاوێکی ئاینی مەسیحی بووە بۆیەکەمجا ربەردی بناغەی ئەم گوندەی داناوە٠بەلاَم بەبۆچوونی خۆم وشەکە زۆرنزیکە لەناوی شاری (حەران) ، کەدەبێ وشەکە بەم شێوەیە گۆڕابێ : (حەران — حۆران — خۆران)٠

٭سندوقی ڕەشی فڕۆکە :

"داڤیدوارن" کەکیمیازانێکی ئوستوڕالی یە لەساڵی (١٩٥٨) یەکەم سندوقی ڕەشی فڕۆکەی د روستکردووە ، کەلەڕاستی دا سندوقەکە ڕەنگی ڕەش نییە ، بەڵکورەنگی سووریان پرتەقالی یە ، بەلاَم بەهۆی کارەساتەکانی کەوتنەخوارەوەوتێکشکانی فڕۆکە واناونراوە ، کەبریتین لە دووسندوقی سووریان پرتەقالی کەدرێژی هەریەکەیان (٥٠) سم و بەرزیان (٥،١٧)سم دەکەو ێتەکۆتایی کلکی فڕۆکەوە٠کارەکەی بریتییە لەتۆمارکردنی دەنگەکانی وەك گفتوگۆی نێوان دەستەی فڕۆکەوان ومشتومڕەکان وهاواری فریاکەوتن و٠٠٠هتد٠ئەم دووسندووقە ڕەنگیان پرتەقالی یە لەدوورەوە دەبریقێنەوە ، تالەکاتی ڕووداوەکان دا زووبدۆزرێنەوە٠دەتوانن بەر گەی پلەی گەرمی (١١٠٠)پلەی سەدی بگرن ولەماددەی (نیتانیۆم) دروستکراون تەنانەت پۆ لاَش کاریان تێناکات٠

⋆تەڕبووش :
کلاوی سوور چەندتاڵەدەزوێکی پێوەیە لەدوگمەیەکەوە شۆڕدەبێتەوە لەسەردەمی عوسمانی لە(تورکیا)لەسەردەکرا٠
⋆ڕۆیتەرز :
ناوەکەی دەگەڕێتە بۆ(پۆل جۆلیۆس ڕۆیتەر)ی بەرەچەلەك ئەڵمانی و بەرەگەزنامە بەریتانی٠
⋆نانی تیری لەچییەوە هاتووە ؟
بەونانە دەوترێت ، کەئەنگوتك لەسەرفەرش بە(تیرۆك)پان دەکرێتەوە ، لە (نان + تیرۆك) هاتووە٠
⋆بازیان :
بازیان ناوچەیەکی فراوانە دەکەوێتە نێوان (سلێمانی – کەرکوك) لەوشەی (باز) هاتووە وا تا باڵندەی باز٠
⋆خەتێ :
گوندی (خەتێ) کەوتۆتە ناوچەی خۆشناوەتی ، لەبارەی ناوەکەی چەند بۆچوونێك هەیە ، یەکەمیان دەڵێ : لەبەرئەوەی یەکەم گوندی خۆشناوەتییە پاش کۆتایی هاتنی دۆڵی هەرووتیان بۆتە خەتێك یان هێڵێك بۆجیاکردنەوەی سنوری خۆشناوەتی لەسنوری هەروتیان٠بۆچوونی دووەم دەڵێ : لەخەیاتەوە هاتووە لەبەرئەوەی خەڵکێکی زۆری ئەم گوندە بەپیشەی خەیاتییەوە خەریك بووە٠بۆچوونی سێیەمیان دەڵێ : لەوشەی خەت ونوسین هاتووە لەبەر ئەوەی ئەم گوندە سەرچاوەی خوێندنی زانستەکانی ئاین بووە ، بەڵام بەبۆچوونی خۆم ڕای یەکەم مەعقول ترە٠
⋆مامەیارە :
گۆڕستانێکە کەوتۆتە ڕۆژهەلاتی شاری سلێمانی بەرامبەربەگردی سەیوانە٠لەسەردەمی کۆندا ناوی (گردی گولان)بووە ، وەکولەدێرە شیعرێکی سالمی ساحێبقران دا هاتووە :

دەرپەڕین بازمەیلی ئیقدامیان نەبوو لەوبیدعەتە
حەسرەتا یەك دڵ نەگەینە شیوەکەی گردی گولان

مامەیارە ناوی ئەحمەدە ، خەڵکی ناوچەی شاربازێڕە سەرۆکی تۆپخانەی پاشای میرنشینی بابان بووە ، کەنەخۆش دەبێ وەسیەتنامەیەك دەنوسێ ، دەڵێ : ئەگەرمردم مەمبەنە گرد ی سەیوان بم بەن بۆسەرگردەڕووتەکەی گولاًن لەوێ بمنێژن٠بەهۆی مامەیارەوە ناونراوە پیرەمێردیش وەسیەتی کردووە کەمرد لەتەنیشت مامەیارە لەسەرئەوگردە بینێژن ، (جه میل صائیب)یش لەوێ نێژراوە٠

گردی گولاًن ناوەکەی لەچییەوە هاتووە ؟

"گولی" جۆرەنەخۆشییەکە تووشی مرۆڤ دەبێ لەوکاتەدا ئەوەی لەدیوی ئێران بەکۆمەڵ دە هاتن بۆسلێمانی لەوێ دەمردن بەجیا لەوگردە دەیانناشتن٠

*شوناس : کەلتور

*ئەشکەوتی هەزارمێرد :

ئەشکەوتێکە دەکەوێتە باشوری خۆرئاوای شاری سلێمانی ، ناوی ئەشکەتەکە واتا هەزارپیاو دەشێ ئەم ناوە لەبەرفراوانی ئەشکەوتەکە هاتبێ ، کەجێی هەزارکەسی لێ دەبێتەوە یاخود واتا هەزارمەرد یاخود لەهەزارمێرگەوە هاتبێ ، چونکە ناوچەیەکی بەئاوە٠

*ئەمیل زۆلا :

نوسەرێکی فەڕەنسی یە٠

*قەرەداغ :

شارۆچکەیەکە کەوتۆتە باشووری شاری سولەیمانی و ناوی قەرەداغ لەزمانی تورکی دا قەرە تاغ بەمانای کێوی ڕەش دێت ناوی دێرینی بریتییە لە (زەردیاوا)٠

*مارتن لۆسەر :

چاکسازێکی نەصرانی بوو دامەزرێنەری مەزهەبی پڕۆتستاتی یە لەساڵی (١٤٨٣) لەئیتاڵیالەد ایکبووە لەساڵی (١٥٤٦) کۆچی دوایی کردووە٠گرینگترین چاکسازییەکانی لەم خالاًنەی خوارە وە خۆیان دەنوێنن :-

١- نەهێشتنی چەکی لێخۆشبوون٠

٢- قەشەکان چیدی ڕەبەنی نەکەن وهاوسەرگیری بکەن تاکوداوێنپیسی نەبێت٠

٣- هەڵوەشاندنەوەی ئەوتەفسەی کەنەصرانییەکان نان وشەراب دەخۆن خواپەنامان بدات پێیان وایە دەگۆڕێت بۆ جەستەی مەسیح و خوێنەکەی٠کردارێکی بێمانایە نانەکە ببێتە گۆشتی حەزرەتی مەسیح وشەرابەکە ببێتە خوێنی٠

*بەکرەجۆ :

بەکرەجۆدەکەوێتە باشووری ڕۆژئاوای شاری سولەیمانی و(١٥)پانزە کیلۆمەتر لەئەشکەوتی هەزارمێردەوە دوورە٠بەکرەجۆمێژوێکی کۆنی هەیە دەگەڕێتەوە بۆسەردەمی بابانەکان٠ بەکرناوێك لەسەرچنار جۆگایەکی لێداوە ئەوکاتە بەبەکرجۆگاناسراوە وەلەناوچەی شاور لەنزیك ڕانیە بەجۆگا دەڵێن : (جۆ)٠

*بالیسان :

شارۆچکەی بالیسان دەکەوێتە ناوچەی خۆشناوەتی لەسەردەمی ئەخمینییەکان لەبالیسان شارێك هەبووە بەناوی (دێگە) دێگەشا پاشای ئەم شارەبوو٠سەبارەت بەناوی بالیسان چەند بۆچوونێك هەیە :-

١ - بالیسان وشەیەکی ئارامییە واتا ئەوباخانەی کەوتۆتە بەرزایی٠

٢ - وشەیەکی فارسییە واتا باڵ پیشاندان ، باڵ واتا قۆڵ وسان واتا پیشاندان٠

٣ - وشەکە تورکییە بالی واتا هەنگوین وسان واتا تۆو٠

٤ - بالیسان بەزمانی عیبری بەواتای فێنك وقەدپاڵ دێ٠

*بۆرسە :

بۆرسە واتاکەی ئاشکرایە ، ناوی بۆرسە لەناوی بنەماڵەیەکی بەلجیکی یەوە هاتووە بەناوی (ڤاندەربورسەن) کەلەبواری بانك وسەراف دا کاریان دەکرد٠

*محەممەد مەحمود قودسی :

لەساڵی (١٩٢٢) لەشاری قودس لەدایکبووە باوکی لەقودس ژنێکی چەرکەسی هێناوە نۆبەرە کەی محەممەد لەقودس لەدایکبووە خۆی خەڵکی سولەیمانی بووە لەبەرئەوە بەقودسی ناو ی دەرکردووە٠چۆتە پاڵ کۆماری مەهاباد ولەحوزەیرانی ساڵی (١٩٤٧) لەسێدارە درا٠

٭عیززەت عەبدولعەزیز :

لەساڵی (١٩١٢) لەئامێدی لەدایکبووە پەیوەندی بەکۆماری مەهابادەوە کردووە دوای شکستی کۆماری مەهاباد وگەڕانەوەی بۆعیراق دەستگیردەکرێت ولەسێدارە دەدرێ٠

٭مستەفاخۆشناو :

لەساڵی (١٩١٢) لەبێتواتە لەدایکبووە پلەی ئەفسەری نەقیب بووە چۆتە پاڵ کۆماری مەهابا دولە ١٩ای حوزەیرانی ساڵی (١٩٤٧) لەسێدارە درا٠

٭خەیرڕوللاعەبدولکەریم :

لەساڵی (١٩١٢) لەشاری هەولێرلەدایکبووە لەساڵی (١٩٤٦) چۆتە پاڵ کۆماری مەهابادو لە١٩ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٤٧) لەسێدارە درا٠

٭الکندی :

فەیلەسوفێکی بەناوبانگی سەدەی نۆیەمی میلادی یە ، نوسەری پەرتووکی (رساله المعمور من الارض ) و(رساله فی الربع المسکون) ە٠

٭ابن فردادبه :

لەسەدەی دەیەمی میلادی ژیاوە ، نوسەری پەرتووکی (المسالك والممالك)ە یانی (ڕێگاکان و ویلایەتەکان)٠

٭ئەبورەیعان بیرونی :

جوگرافیزانێکە (٣٦٢ – ٤٤٠)کۆچی ، گرینگترین بەرهەمی (تحقیق ماللهند) ، چەندبیروباوە ڕێکی هەبوولەوانە زەوی شتەکان بەرەوخۆی ڕادەکێشێ بڕوای بەهێزی کێشکردنی زەوی هە بوو٠

٭ابن بطوطة :

ئەم جوگرافیزانە لەساڵی (٧٠٣)ك لەتەنجەی مەغریب لەدایکبووە٠

٭ئازەربایجان :

بەمانای جێگای ئاگر (ئازەر + بایجان)٠

٭ئۆزباکستان :

ئۆزبەك بەتورکی واتا (سەگ) ستان واتاسەرزەمین واتا سەرزەمینی سەگەکان٠

★ئینگلەند (ئینگلیز) :

واتاسەرزەمینی ئەنگلەکان

★سکۆتلەندا :

واتاسەرزەمینی سەکسۆنەکان

★ئێران :

بەواتای سەرزەمینی ئارياييەكان ، (ئاری)ش بەواتای نەجیب٠

★بەحرێن :

واتادوودەریا ، چونکە کەوتۆتەنێوان دووکونداوی بچووکەوە٠

★بەڕازیل :

لەناوی داری بەڕازیل هاتووە ، کەدارێکی ڕەنگ سوورە بەواتای داری سوور٠

★بەرمۆدا :

لەناوی کەشتیوانی ئیسپانی (جواندی بەرمودز) هاتووە ، کەلەساڵی (١٥٣٠) دۆزییەوە٠

★بەلجیك :

ناوی تیرەیەکی هیندۆئەوروپی بوو ، کەلەناوەڕاستی ئەوروپاوە دەژیان٠

★تاجیکستان :

واتاسەرزەمینی تاجیکەکان٠

★جەبەل تاریق :

لەناوی تاریقی کوڕی زیاد هاتووە ، کەفەرماندەی موسوڵمانەکان بوو لەساڵی (٧١)ی کۆچی هەوڵی گرتنی ئیسپانیایدا٠

★داغستان :

واتاسەرزەمینی چیاکان یان کوێستانەکان٠

★دانیمارك :

واتاهێلی سنوری دانەکان٠

★ڕوسیا :

واتاسەرزەمینی ڕوسەکان٠

⋆سریلانکا :

دورگەی جوان٠

⋆سەنگاپورە :

شای شێر

⋆سرپبیا :

سەرزەمینی سرپەکان

⋆فەڕنسا :

سەرزەمینی فرەنکەکان

⋆فلیپین :

لەناوی شا (فلیپ) هاتووە٠

⋆قوبرس :

بەزمانی یۆنانی واتا (مس) ئاماژەیەبۆکانەکانی مس لەم دورگەیە٠

⋆قیرغستان :

بەزمانی تورکی واتا سەرزەمینی (چل تیرە)٠

⋆لیبیریا :

لەلاتینی لیبر واتا ئازاد

⋆لیبیا :

لەناوی هۆزێکی کۆنی بەربەر(ئەمازیخ)وەرگیراوە٠

⋆مالیزیا :

نیشتیمانی مالایی

⋆مۆریتانیا :

مۆر هۆزێکی بەربەرە٠

⋆مۆناکۆ :

هۆزەکانی مۆنك

★هندۆراس :
لەئیسپانی واتا قولاییەکان بەهۆی ئاوە قووڵە کەنارییەکان کۆڵۆمب ناوی لێنا٠
★یەمەن :
لەزمانی عەرەبی یەمین واتا لای ڕاست٠
★ئێتمۆلۆژی :
وشەیەکی گریکی (یۆنانی)یە واتا لێکۆڵینەوە لەواتای ئەسڵی وبنەڕەتی وشە ، ئەوپەیوەند
ییە خزمایەتییەی کەلەگەڵ وشەکانی تری ئەوزمانە یان زمانانی تردا هەیەتی٠
★خان :
وشەیەکە واتای گەورەیی دەگەیەنێ وەك : جەنگیزخان ، ٠٠٠هتد وشەی خان بۆڕێزلێنان لە
پاڵ ناوی هەمووژنێك دێ لەناوکوردیش دا سەرەك خێلەکان لەقەبی خانیان لەخۆیان ناوە
وەك : برایم خان ، ٠٠٠هتد٠
★ئەفەندی :
ئەم وشەیە واتای سەیدی عەرەبی دەگەیەنێ لەزمانی تورکی دا هاتۆتە ناوزمانی کوردی٠
★ئاغا :
لەئێران ئاغا وەك وشەی سەیدی عەرەبی ومیستەری ئینگلیزی وهێری ئەڵمانی بۆڕێزلێنان
دەخرێتە پێش ناوی پیاوانەوە٠
★شا :
دەخرێتە پێش ناو وەك : شاعەباس ، هەروەها دەخرێتە پاش ناویش وەك : نادرشا٠
لەزمانی کوردی دا وشەی شا ژمارەیەکی زۆرناوی لێکدراوی لێ سازکراوە ، وەك : شاکار ، شا
دەمار ، شاڕێ ، شاگوڵ ، شاژن ، شاسوار ، شاڕەگ ، ٠٠٠هتد٠لەم نموونانە وشەی شا واتا : گەو
رەترین ، چاکترین ، نایابترین٠
★میرزا :
واتائەمیرزادە لەسەردەمی تەیموری لەنگ دا زۆرباوی هەبوو ، هەروەهائەم وشەیەسنوری بە
کارهێنانی فراوانبوو وای لێهات لەپێش ناوی نوسەرانەوە دادەنرا٠
★خواجا :

وشەی خواجاش بۆڕێزلێنان هاوواتای وشەی سەیدی عەرەبی ومیستەری ئینگلیزی بەکاردە هات٠

٭وەزیر :

ئەم وشەیە لەعەرەبی دا بەواتای یارمەتیدەری کارامەوهەلگری باری قورس وگران بەکاردێ ئەم لەقەبەش لەسەدەی هەشتەمی میلادی ئەبوجەعفەری مەنسوڕ بەوەزیرەکەی خۆی (ئە بوسەلە)ی بەخشیوە٠

٭گیو :

لەزمانی ئێرانی کۆن دا واتا ژیان٠

٭ماڵ :

وشەی ماڵ لەزمانی کوردی دا چەند واتایەك دەگەیەنێت وەك : سەروەت وسامان ، مەڕوما ڵات ، جێی ژیان ونوستن وحەوانەوەی مرۆڤ ، وشەی ماڵ لەبنچینەدا دەچێتەوە سەروشەی (مال)ی عەرەبی واتاسەروەت وسامان٠ئەمە ماڵی منە٠واتاخانوو لەزمانی ترشێوەکەی بۆتە مۆڵ٠لەماڵەوە هاتم٠ناڵێ لەخانووهاتم٠خانوێکمان کڕیوە٠ نەك ماڵێکمان کڕیوە٠ فۆڕمی خا نەش ، وەك : نەخۆشخانە ، قوتابخانە ، چاپەخانە ، سەرتاشخانە ، چێشتخانە ، ٠٠٠هتد٠

٭دۆم :

وشەی دۆم لەڕوسی دا بەواتای خانووبەکاردێ ، (دامەس)ی هیندی کۆن واتای ماڵی بەخشیو ە ، (دۆمۆس)ی یۆنانی واتای خانووبینای گەیاندووە٠

٭زۆرجارکەباسی ئاین لەهیندستان دەکرێ باس لەوەدەکرێ مشك ومارومانگاوشتی سەیردە پەرستن ، هەروەهائەوبتانەی دەیانپەرستن سێ جۆرەبتیان هەیە : یەکێکیان لەسەرشێوەی پیاوە ڕمێکی بەدەستەوەیە ، ئەوی تریان ئافرەتە، سێیەمیشیان لاشەی منداڵێکەسەری فیلی پێوەلکێندراوە٠پێیان وایە یەکێکیان خودای باوکەوئەوی تریان دایکەوهی سێیەمیشیان کوڕ ە٠ئەوەی کوڕە سەرەکەی فیلە بە (گانێش گرەنت پەتی پەپا) ناسراوە ، کەسالأنەجەژنێکیان هەیە بە (گرەنت پەتی پەپا) ناوی دەبەن بەپێی ئەفسانەکە خودای باوك دەیەوێت قوربا نی بکات ، بەلأم هیچی بەدەست ناکەوێت بیکاتەقوربانی بیرلەکوڕەکەدەکاتەوە سەری کوڕە کە (گانیش) لێدەکاتەوە ودەیکاتەقوربانی ، بەلأم کوڕەکەپاش لێکردنەوەی سەریشی هەربە

نەمری دەمینێتەوە باوکیش لەجیاتی سەری کوڕەکە سەری بێچووە فیلێك لەشوێنی سەری کوڕەکەدادەنێ بەم شێوەیە خودای منداڵ تائێستاسەرەکەی لەسەری فیلە ساڵانە هیندییەکا ن یادی ئەوچیرۆکە ئەفسانەییە دەکەنەوە کەبەجەژنی (گرەنت پەتی پەپا) ناوی دەبەن و خودای منداڵ کەبوکەڵەیەکە دەهێننەبازاڕو شوێنەگشتییەکان تالەکۆتایی مەڕاسیمەکە خو داکەیان فڕێدەدەنە نێوڕووبارودەریاچەکان ئینجالەبازاڕبتێکی تردەکڕنەوە تاکوساڵی داها توو٠

٭عەزل :

بریتییە لەجلەوگیری منداڵبوون بەوەی پیاوتۆوی خۆی نەخاتە ناوڕەحمی هاوسەرەکەی ، درودی خوای لەسەربێ فەرموویەتی : (لاعلیکم أن لاتعزلوا) رواه البخاری والمسلم واتا : (لە سەرتان نییە عەزل نەکەن)٠

٭گولی :

نەخۆشییەکە لەشی ئینسان سووردەکاتەوە ، پاشان ڕەش دەبێتەوە وشەق دەبات وپارچە پار چە دەردەکەوێت٠

٭خورماڵ :

خورماڵ ناوچەیەکە سەربەهەڵەبجە ، لەبارەی ناوی خورماڵ چەند بۆچوونێك هەیە ، یە کێکیان دەڵێ : پیاوێك بەناوی (ماد) کچێکی هەبووە ناوی (خۆر)بووە بووە بەخورماد بە تێپەڕبوونی ڕۆژگاربووە بەخورماڵ٠ماوەیەکیش خورماڵ بە (گوڵ عەنبەر) ناوبراوە ، لە بارەی وشەی گوڵ عەنبەریش عەنبەر کچی بەدری حەسنەوی بووە بەهۆی ئەوەی ئەم ژنە بایەخێکی زۆری بەمەلاوفەقێ وزاناکان داوە ٠٠٠

٭مانای فسق چییە ؟

لەبنچینەدا ئەگەردەنکی خورما لەتوێکڵی خۆی دەرچوو پێی دەڵێن : (فسق)٠

٭ابن کثیر :

ناوی (ئیسماعیل کوڕی عومەری کوڕی کثیر)ە لەساڵی (٧٠١)ی کۆچی لەگوندێکی دەوروبەر ی شاری دیمەشق لەدایك بووە ، لەساڵی (٧٧٤)ی کۆچی وەفاتی کردووە لەتەنیشت ابن تیمیە بەخاك سپێردراوە ، لەکتێبە بەناوبانگەکانی (البدایە والنهایە)یە٠تەمەنی چوارساڵ بووە با

وکی مردووە٠

★پێڵاوەکانی چارلی چاپن :
نیمچە پۆتینێکە پاژنەکەی کونە ، کەلەیەکێ لەدوافیلمەکانی لەپێی کردبوو نرخی ئەم جو
وتە پێڵاوە نزیکەی (٢٥٠) هەزاردۆلاری ئەمریکی یە٠
★ئەوتفەنگەی کەجۆن کەنەدی پێ کوژرا (١٩١٧ — ١٩٦٣) :
نرخی ئەم تفەنگە (٢٠) هەزاردۆلاری ئەمریکی یە٠
★کلاوەکەی وینستۆن چەرچل (١٨٧٤ — ١٩٥٦) :
چەرچل هەمیشە کلاوێکی ڕەشی لەسەردەکرد ، نرخی ئەم کلاوە (١٠) هەزاردۆلاری ئەمر
یکی یە٠
★مارسیدسەکەی ئادۆلف هیتلەر (١٨٨٩ — ١٩٤٥) :
نرخی ئەم ئۆتۆمبیلە نزیکەی یەك ملیۆن ونیو دۆلاری ئەمریکی یە٠
★فلچەی نیگارکێشانی هونەرمەند پابلۆپیکاسۆ (١٨٨١ — ١٩٧٣) :
پیکاسۆزۆرجاران کاسەیەکی پڕلەبۆیە دەکرد لەسەرکورسییەکی دادەنا ئەوسادەستی بەنیگار
کێشان دەکرد ، نرخی ئەم کورسییەوکەرەستەکانی سەری بای (٢٥٠) هەزاردۆلاری ئەمریکی
یە٠
★ئەوفیشەکەی کەمەهاتماگاندی پێ کوژرا (١٨٦٩ — ١٩٤٨) :
لەساڵی ١٩٤٨ کاتێ گاندی لەشاری نیودەلهی لەناوچەیەکەوە بۆناوچەیەکی تردەڕۆیی تەقەی
لێکراوبەفیشەکێك کوژرا٠گاندی هیندییەکان ناویان لێنابوو (ماهاتما) واتا(ڕۆحێکی فراوان)
ساڵی پێش کوشتنی داگیرکەری لەسەرخاکەکەی وەدەرناو هەرلەوکاتەوە هیندستان کەزۆربە
یان هیندۆسن وپاکستان کەزۆربەیان موسوڵمانن لەیەك جیابوونەوەوجەنگێکی گەورەلەنێوا
نیان دا ڕوویدا ، گاندی لەهەوڵ دابووبۆڕێکخستنی هەردوولا ئەمەش بووەهۆی ئەوەی کەتو
ندڕەوێکی هیندی تەقەی لێ بکاوبیکوژێ٠ نرخی ئەم فیشەکە نزیکەی (٢٠٠) هەزاردۆلاری
ئەمریکی یە٠

٭ئەوبەدلەیەی کەئارمسترۆنگ لەکاتی چوونی بۆسەرمانگ پۆشیبووی :
لەساڵی ١٩٦٩یەکەم مرۆڤ بووپێی خستە سەرمانگ نرخی ئەم بەدلەیە نزیکەی دووسەدملیۆ
ن دۆلاری ئەمریکی یە٠
٭حەللاج :
ناوی حوسێنی کوڕی مەنسورە لەساڵی (٨٥٨)ی میلادی لەشارۆچکەی بەیزای فارس لەوڵاتی
ئێران لەدایکبووە٠هۆی ئەوەی کەپێی وتراوە حەللاج ، چونکە باوکی ئیشی هەڵچنینی خور
ی کردووە٠لەتەمەنی سێ ساڵی لەگەڵ باوکی کۆچ دەکەن بۆشاری (واسیت) لەعیراق خاوەن
میتۆدی سۆفیزمی فەلسەفی بووە بەهۆی تیۆری (حلول) واتائاوێتەبوونی گیانی مرۆڤ لەگە
ڵ گیانی خودا یەکەمین کەس بووبیرۆکەی حلولی هێنایەناوجیهانی سۆفیگەری بەهۆی ئەم
بۆچوونە لەسێدارەدرا لەسەردەمی عەبباسییەکان بەهۆی وتنی (أناالحق) بۆیە لەشیعرەکانی
دا بیرۆکەی حلولی هێناوە (خواپەنامان بدە) دەڵێ :

أنامن أهوى ومن أهوى أنا
نحن روحان حللنا بدنا
فاءذا أبصرتني أبصرته
واذا أبصرته أبصرتني

واتا :

من کێم ئەو کێیە منی دەوێ
ئێمەدووگیانین لەنێویەك کلێشەدا
ئەگەرمنت بینی ئەوائەوت بینیوە
ئەگەرئەویشت بینی ئەوامنت بینیوە

٭ئەنیما :
نەخۆشی کەمی هیمۆگلۆبین لەخوێن دا٠
٭مەلاریا :
وشەیەکی ئیتاڵییە واتا هەوای خراپ وژەهراوی٠
٭ڕۆماتیزم :
نەخۆشی باداری

★شاری هەولێرلەساڵی (١٩١٩) بووبەپارێزگا٠
★نەخۆشخانەی ڕزگاری (مدينة طب) لەساڵی ١٩٨٢ دروستکراوە٠
★باخچەی گڵکەند لەهەولێر لە (١٩٦٣) دروستکراوە٠
★ئۆتارکی :
سەربەخۆیی ئابوری
★ئەووێنەیەی لەسەردراوی پێنج دۆلاری ئەمریکییە (ئەبراهام لینکۆلن)ە٠
★ئەو وێنەیەی لەسەردراوی (١٠) دە دۆلاری ئەمریکییە (ئەلیکساندەرهاملتۆن)ە٠
★ئەو وێنەیەی لەسەردراوی بیست دۆلاری ئەمریکییە (ئەندرۆجاکسۆن)ە٠
★ئەو وێنەیەی لەسەردراوی پەنجا دۆلاری ئەمریکییە (یۆلیسیس گرانت)ە٠
★ئەو وێنەیەی لەسەردراوی (١٠٠)سەد دۆلاری ئەمریکییە (بنیامین فرانکلین)ە٠
★ئەو وێنەیەی لەسەردراوی دوو دۆلاری ئەمریکییە (تۆماس جیفرسۆن)ە٠
★ئەو وێنەیەی لەسەردراوی یەك دۆلاری ئەمریکییە (جۆرج واشنتن)ە٠
★لەئۆتۆمبیلی ئیسعاف بەپێچەوانەوە نوسراوە ئیسعاف لەبەرئاوێنەی ئەوئۆتۆمبیلەی پێشی
★حەران :
شارێکە دەکەوێتە سوریای ئەمڕۆ نزیك سنوری تورکیا٠
★گابرێیل گارسیا مارکیز :
ڕۆماننوسێکی بەناوبانگی کۆلۆمبیایە وخاوەنی خەلاتی نۆبڵە لەساڵی (٢٠١٤) لەتەمەنی (٨٧) ساڵی کۆچی دوایی کرد ، گرینگترین بەرهەمی ڕۆمانی (سەد ساڵ تەنیایی)یە٠
★وشەی (ئەلو) ناوی خۆشەویستەکەی داهێنەری تەلەفۆن (گرهام بێل)ە کەناوی (ئەلێساند را لۆلیتا ئۆسوالدوو)بوو لەپیتی یەکەمی ناوەکەی وەرگیراوە٠
★نۆکیا :
کۆمپانیایەکی تایبەتە بەدروستکردنی مۆبایل ، نۆکیا ناوی گوندێکە لەوڵاتی فنلەندا٠

★ناسا :
کورتکراوەی (ئیدارەی نیشتیمانی بۆگەشتی ئاسمانی)یە ئاژانسێکی سەربەحکومەتی ئەمر یکایە لەساڵی (١٩٥٧) دامەزراوە٠

★وشەی الفرقان لەئایەتی (٤)ی سورەتی (ال عیمران) وئایەتی (١)ی سورەتی (الفرقان) مەبە ست قورئانی پیرۆزە٠گوزارشت لەجیاکردنەوەی خێروشەڕ ، چاکەوخراپە ، حەق وناحەق ، حەلال وحەرام دەکات٠

★وشەی ئوممی دووڕاڤەی بۆدەکرێت :-
یەکەم : واتا ئەوەی کەناتوانێت بخوێنێتەوەوبنووسێت٠
دووەم : ئوممی کەسێکە کەچۆن لەدایکبووە هەروادەمێنێتەوە وەك چۆن منداڵ کەلەدایك د ەبێت پاکە بێتاوانە پڕبەرائەتە٠

★ئەصڵ وفەصڵ : باب وباپیر
★تەوبەی نەصوح :
ئەوتەوبەیەیە ، کەهەرگیزنەشکێندرێ٠
★قومری :
باڵدارێکە لەکۆتربچووکترە٠
★جیلوە : دەرکەوتن
★نەوازش : دڵدانەوە
★نەسخ : هەڵوەشاندنەوە
★شنروێ : چیایێکە لەڕۆژهەلأتی هەڵەبجە
★مۆنتکارلۆ : شارێکە کەمەرکەزەکەی مۆناکۆیە٠
★خەزان : زەرد هەڵگەڕان و وەرینی گەلاٚ
★قووت : خۆراك
★حەیران : سەرسام

٭شێخی چۆلی :

ناوی (محەممەد)ە ، هەولێری بوو خەلیفەی شێخ عوسمانی سیراجەددینی تەوێڵەیی بوو ، لەگەڕەکی عارەبان مزگەوتی لەدەرەوەی شاردروستکردووە٠

٭محەك : ئەوبەردەیە ، کەزێڕوزیوی پێ تاقی دەکەنەوە٠

٭وەرزێر یان وەرزیار : کرێکاری کشتوکاڵی یە تەنهالەوەرزی دروێنەوگێرەدا لای خاوەن دە غل ودان ئیش دەکات بەرامبەربەئەندازەیەك لەبەرهەم کە زیاتروایە شەش یەك بێ بەرا مبەربەوە (مزوور) یان (ڕەنجبەر) هەیە ، کەبەدرێژایی ساڵ ئیش دەکات٠

٭خەجل : شەرم

٭مەدهۆش : سەرسام ، واق وورماو

٭بژوین : لەوەڕگە ، شوێنێك کە گیاوگۆڵی زۆربێ٠

٭سێ کوچکە :

لەبنەڕەت دا بەوسێ بەردە وتراوە ، کەئاگریان لەنێوان دا کراوەتەوە ومەنجەڵیان لەسەردا نراوە٠

٭شاکەل : گوندێکە سەربەقەزای کفری یە٠

٭لەعل :

یەکێکە لەبەردە بەنرخەکان ، کە ڕەنگی سوورە٠

٭کەندو :

وەکوبەرمیلی نەوت بوو ، لەقوڕ دروست دەکرا بۆهەلگرتنی زەخیرە٠

٭چین وماچین :

چین : ولاتی چین

ماچین : وشەی کورتکراوەی (مهاچین)ە واتا چینی گەورە٠

٭طبران : ناوچەیەکە لەئێران

## سەرچاوەکان :

**نوسینەکانی ئەم کتێبە لەم سەرچاوانەی خوارەوە وەرگیراوە : -**

**یەکەم – کتێب :**


**١ – قورئانی پیرۆز٠**

**٢ – عەبدوللەتیف یاسین عەلی ، دەروازەیەك بۆجیهانی سینەما ، چاپخانەی ئاسۆ ، بێ سا لّی چاپ٠**

**٣ – دایکی عەبدوللاٌ ، سەرەتای بوومەلەرزەیەك بەهاوسەربوونی ئیسلامی ، ١٤٢٥ ی کۆچی٠**

**٤ – موسلیم مەلاسالح فریزی ، گوڵبژێرێك لەبابەتەکانی مەلایەکی کورد ، چ١ ، ٢٠٠٩**

**٥ – جمال الدین أبوالفرج ابن الجوزی ، تلبیس ابلیس (سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس) ، و : نوری هەمەوەند ، چ٢ ، چاپخانەی نارین ، ٢٠١٨**

**٦ – جەمشیدحەمەڕەشید ، زانستی تەجویدبۆباشترخوێندنەوەی قورئان ، چاپخانەی سیما ، سلێمانی ، ٢٠١٤**

**٧ – بەندەیەکی خودا ، چوارزاراوەکەی قورئان ، بێ شوێنی چاپ ، بێ ساڵی چاپ٠**

**٨ – محەممەد مەلا ئیسماعیل ئێنەیی ، ڕۆڵی لێژنەی فەتوا لەکوردستان دا ، چ١ ، هەولێر ، ٢٠١٧**

**٩ – سامان نەجم هەڵەبجەیی ، کیمیاوفیزیا ، چ١ ، چاپخانەی هێڤی ، ٢٠١٥**

**١٠ – نظمی قادرتەوێڵەیی ، واتاکانی وشکانی گۆی زەوی (کیشوەرووڵات ودورگەکان) ، چ١ ، چاپخانەی نارین ، ٢٠١٣**

**١١ – فارووق عومەرسدیق ، ڕەچەڵەکی وشەوپەلهاویشتنی ، چ١ ، چاپخانەی نارین ، ٢٠١٥**

**١٢ – ئیبراهیم ئەحمەدشوان ، مەڵۆیێ لەئەدەبی منداڵانی کورد ، چ١ ، چاپخانەی هێڤی ، ٢٠١٨**

**١٣ – محەممەدسالح پێندرۆیی (جگەرسۆز) ، کلیلەکانی سەرکەوتن ، چ١ ، چاپخانەی ڕۆژهەلاٌت ، هەولێر ، ٢٠١٤**

**١٤ – أبوالاعلی المودودی ، تێوری سیاسی ئیسلام ، و : ئامۆژگاربەرزنجی ، چ١ ، نوسینگەی تەفسیر ، هەولێر ، ٢٠٠٥**

١٥ – وریامەعرووف ، دزی وئاكامەكانی ، چاپخانەی ڕۆشنبیری ، هەولێر ، ٢٠١٣
١٦ – ابن رجب الحنبلی ، جامع العلوم والحكم ، و : حەمەئەمین ئەحمەد حەمەعەلی بەرز نجی ، چ١ ، نوسینگەی تەفسیر ، هەولێر ، ٢٠١١
١٧ – محمود أحمد البرشە ، كانیاوی بڕواداران ووتاربێژان بۆوتاری هەینی وبۆنەكان ، و : عەبدولڕەحمان تەها ، چ١ ، كتێبخانەی حاجی قادری كۆیی ، هەولێر ، ٢٠٠٨
١٨ – ئیمامی غەزالی ، پوختەی ڕێبازی خواناسان بەرەوبەهەشتی پەروەردگاری جیهانییان ، و : عباس محمدامین ، چ١ ، چاپخانەی نارین ، ٢٠١٧
١٩ – مەلا عەبدولكەریمی مودەڕیس ، الانوارالقدسیە فی الاحوال الشخصیە ، و : عومەرشێخ نورەددین موفتی.
٢٠ – باوكی حارس ، ئادابی خواردن وخواردنەوە ، بێ شوێنی چاپ ، ٢٠١٦
٢١ – شیخ الحافظ الحكمي ، الاعلام السنة المنشورة ، و : ئارام قادر ، چ٣ ، چاپخانەی ڕ ێ نوێ ، ٢٠١٣
٢٢ – محمد عەبدولڕەحمان لەتیف ، برایەتی نێوان موسوڵمانان ، چ١٤ ، چاپخانەی زانا ، سلێمانی ، ٢٠١٦
٢٣ – ابن كثیر ، ژیاننامەی پێخەمبەران (علیهم السلام) ، و : كاروان محەممەد ، چ٢ ، چا پخانەی مەهارەت ، تەهران ، ٢٠٠٨
٢٤ – محەممەد جەودەت ، دەروازەیەك بۆسۆفیزم ، چ١ ، چاپخانەی شەهاب ، هەولێر ، ٢٠١٦
٢٥ – محمود طعمة حلبي ، دیاری بووك وزاوا بۆژن ومێردی ئیسلامی بەختەوەر ، چ١ ، چاپخانەی نارین ، ٢٠٠٩
٢٦ – سالارهەولێری ، زانیاری ودیاری ٤٠٠٠ پرسیارو وەڵام ، چ١ ، چاپخانەی حاجی قادری كۆیی ، هەولێر ، ٢٠١٦
٢٧ – عەلی عیززەت بیگۆڤیچ ، ئیسلام لەنێوان ڕۆژهەڵات وڕۆژئاوادا ، و : محەممەد چیا ، چ٤ ، چاپخانەی دارالفكر ، بیروت – لبنان ، ٢٠٠٩
٢٨ – عەبدولڕەحمان بەدەوی ، بەرگری لەقورئان دژی ڕەخنەگرانی ، و : وەرزێرحەمەسە لیم ، چ٢ ، ناوەندی سارا ، سلێمانی ، ٢٠١٦

٢٩ – مەحمود ماکاڵ ، گوندی ئێمە ، و : محەممەد بەهرەوەر ، چ٢ ، چاپخانەی ئاراس ، هەو لێر ، ٢٠٠٥
٣٠ – دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی ، ١٩٩٩
٣١ – دیوانی کانی ، ١٩٨٠
٣٢ – دیوانی حاجی قادری کۆیی ، ١٩٨٦
٣٣ – دیوانی مەحوی ، ١٩٨٤
٣٤ – دیوانی وەلی دێوانە ، چاپخانەی کامەران ، سلێمانی ، ١٩٧٠
٣٥ – دیوانی وەفایی ، ١٩٨٤
٣٦ – دیوانی پیرەمێرد ، بەغدا ، ١٩٧٠
٣٧ – دیوانی قانع ، چاپخانەی زانکۆی سلێمانی ، ١٩٧٩
٣٨ – دیوانی صافی ، هەولێر ، ٢٠٠٤
٣٩ – دیوانی ئەحمەدی نالبەند ، چاپخانادهۆکێ ، ١٩٧٠
٤٠ – دیوانی فانی ، بەرگی یەکەم ، چاپخانەی ڕاپەڕین ، سلێمانی ، ١٩٧٦
٤١ – دیوانی حەیدەری ، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین ، هەولێر ، ٢٠٠٠
٤٢ – دیوانی حەمدی ، چ١ ، چاپخانەی سەرکەوتن ، سلێمانی ، ١٩٨٤
٤٣ – دیوانی بێکەس ، چ٢ ، چاپخانەی الادیب ، بەغدا ، ١٩٨٠
٤٤ – دیوانی ئەسیری ، بەرگی یەکەم ، چ١ ، چاپخانەی الحوادث ، بەغدا ، ١٩٨٧
٤٥ – دیوانی عەونی ، چ١ ، هەولێر ، ١٩٩٧
٤٦ – دیوانی ناڵی ، چاپخانەی حاجی هاشم ، هەولێر ، ٢٠٠٨
٤٧ – دیوانی زێوەر ، چ١ ، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە ، هەولێر ، ٢٠٠٣
٤٩ – دیوانی شێخ نوری شێخ سالح ، بەرگی یەکەم ، چ٢ ، دەزگای ئاراس ، هەولێر ، ٢٠٠٨
٥٠ – دیوانی مستەفابەگی کوردی ساحێبقران ، بەرگی یەکەم ، چ١ ، دەزگای ئاراس ، هەو لێر ، ٢٠١٠
٥١ – دیوانی عاصی ، چ١ ، نوسینگەی تەفسیر ، هەولێر ، ٢٠٠٨
٥٢ – دیوانی ویساڵی

٥٣ — دیوانی بێخود ، بەغدا ، ١٩٧٠

٥٤ — دیوانی خالۆ ، چ١ ، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری ، هەولێر ، ٢٠٠٩

٥٥ — دیوانی فەنایی ، چ١ ، چاپخانەی وەزارەتی کشتوکاڵ ، هەولێر ، ٢٠٠٦

٥٦ — دیوانی مەلاتاهیری بەحرکەی ، هەولێر ، ٢٠٠٠

٥٧ — دیوانی میرزاخەلیل منەووەری کاکەیی ، چ١ ، دەزگای ئاراس ، هەولێر ، ٢٠٠٦

٥٨ — دیوانی ئەدەب ، چ٣ ، چاپخانەی هەولێر ، ١٩٦٦

٥٩ — دیوانی ناتق ، ١٩٧٠

٦٠ — دیوانی کاتب ، چ١ ، دەزگای ئاراس ، هەولێر ، ٢٠٠٨

٦١ — دیوانی حەریق ، چ٢ ، چاپخانەی الجمهوریه ، کەرکوك ، ١٩٦٩

٦٢ — دیوانی عەلی باپیرئاغا (کەمالی) ، چاپخانەی کامەران ، سلێمانی ، ١٩٦٨

٦٣ — دیوانی صابری

٦٤ — دیوانی سامی عەودال ، چاپخانەی کارۆ ، سلێمانی ، ٢٠١٠

٦٥ — دیوانی عەلی بەردەشانی ، چ١ ، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە ، هەولێر ، ٢٠٠٦

٦٦ — دیوانی هەوری ، چ١ ، چاپخانەی ڕۆشنبیری ، هەولێر ، ٢٠١١

٦٧ — دیوانی دڵزار ، چ٢ ، چاپخانەی ڕۆشنبیری ، هەولێر ، ٢٠٠٦

٦٨ — دیوانی بێوەی

٦٩ — دیوانی سەفوەت ، بەغدا ، ١٩٨٤

٧٠ — دیوانی بێ دڵ ، چ١ ، چاپخانەی کریستاڵ ، هەولێر ، ١٩٩٩

٧١ — دیوانی موفتی پێنجوینی ، چ١ ، ١٩٩٠

٧٢ — دیوانی ڕازی ، چاپخانەی نەورەس ، سلێمانی ، ١٩٨٣

٧٣ — دیوانی میهری ، ١٩٧٧

٧٤ — دیوانی هێمنی موکریانی ، ٢٠٠٥

٧٥ — دیوانی بێ بەش ، ١٩٨٧

٧٦ — دیوانی دڵساف پشدەری ، ٢٠١٣

٧٧ — هیوا فریاد ڕەس ، ژن وئاین ، چ١ ، چاپخانەی پیرەمێرد ، سلێمانی ، ٢٠١٤

## دووەم – گۆڤار :


١ – هەفتانە ، ژمارە (٣٧) ، ٢٠٠٩

٢ – هەفتانە ، ژمارە (٦٣) ، ٢٠٠٩

٣ – هەفتانە ، ژمارە (١٠١) ، ٢٠٠١

٤ – هەفتانە ، ژمارە (١٢٠) ، ٢٠١٠

٥ – هەفتانە ، ژمارە (٣٣) ، ٢٠٠٩

٦ – هەفتانە ، ژمارە (١١٧) ، ٢٠١٠

٧ – هەفتانە ، ژمارە (١٠٦) ، ٢٠١٠

٨ – هەفتانە ، ژمارە (٤١) ، ٢٠٠٩

٩ – هەفتانە ، ژمارە (٤٢) ، ٢٠٠٩

١٠ – هەفتانە ، ژمارە (٢٥) ، ٢٠٠٨

١١ – هەفتانە ، ژمارە (١٥) ، ٢٠٠٨

١٢ – هەفتانە ، ژمارە (١٠٧) ، ٢٠١٠

١٣ – هەفتانە ، ژمارە (١٢١) ، ٢٠١٠

١٤ – هەفتانە ، ژمارە (١٣٢) ، ٢٠١١

١٥ – زانستی سەردەم ، ژمارە (٢٩) ، ٢٠٠٦

١٦ – زانستی سەردەم ، ژمارە (٥٨) ، ٢٠١٤

١٧ – زانستی سەردەم ، ژمارە (٢٥) ، ٢٠٠٥

١٨ – زانستی سەردەم ، ژمارە (٥٧) ، ٢٠١٤

١٩ – زانستی سەردەم ، ژمارە (٦١) ، ٢٠١٥

٢٠ – زانستی سەردەم ، ژمارە (٥٢) ، ٢٠١٢

٢١ – زانستی سەردەم ، ژمارە (٥١) ، ٢٠١٢

٢٢ – کوردی ڕەسەن ، ژمارە (١٧) ، ٢٠٠٨

٢٣ – زانستی سەردەم ، ژمارە (٣٠) ، ٢٠٠٧

٢٤ – زانستی سەردەم ، ژمارە (٤) ، ٢٠٠٠

٢٥ — زانستی سەردەم ، ژمارە (٢٦) ، ٢٠٠٦

٢٦ — سڤیل ، ژمارە (٢٥٤) ، ٢٠١٤

٢٧ — سڤیل ، ژمارە (١٣٣) ، ٢٠١٢

٢٨ — سڤیل ، ژمارە (١٤٣) ، ٢٠١٢

٢٩ — سڤیل ، ژمارە (٢٥٥) ، ٢٠١٤

٣٠ — سڤیل ، ژمارە (٧٩) ، ٢٠١١

٣١ — سڤیل ، ژمارە (٨١) ، ٢٠١١

٣٢ — سڤیل ، ژمارە (١٤٢) ، ٢٠١٢

٣٣ — سڤیل ، ژمارە (٢٢٠) ، ٢٠١٤

٣٤ — سڤیل ، ژمارە (٢٢١) ، ٢٠١٤

٣٥ — سڤیل ، ژمارە (٢٨) ، ٢٠١٠

٣٦ — سڤیل ، ژمارە (٣١) ، ٢٠١٠

٣٧ — سڤیل ، ژمارە (٣٨) ، ٢٠١٠

٣٨ — سڤیل ، ژمارە (٥١) ، ٢٠١٠

٣٩ — سڤیل ، ژمارە (٥٢) ، ٢٠١٠

٤٠ — سڤیل ، ژمارە (١٠٨) ، ٢٠١١

٤١ — سڤیل ، ژمارە (٢٤٧) ، ٢٠١٤

٤٢ — سڤیل ، ژمارە (١١٣) ، ٢٠١١

٤٣ — سڤیل ، ژمارە (١١٤) ، ٢٠١١

٤٤ — سڤیل ، ژمارە (٢٥٦) ، ٢٠١٤

٤٥ — سڤیل ، ژمارە (٢٥٧) ، ٢٠١٤

٤٦ — سڤیل ، ژمارە (٢٥٨) ، ٢٠١٤

٤٧ — سڤیل ، ژمارە (٢٥٩) ، ٢٠١٤

٤٨ — سڤیل ، ژمارە (١٢١) ، ٢٠١٢

٤٩ — سڤیل ، ژمارە (١٣١) ، ٢٠١٢

**٥٠ — سقيل ، ژماره (٣٩١) ، ٢٠١٥**

**٥١ — سقيل ، ژماره (١٢٣) ، ٢٠١٢**

**٥٢ — سقيل ، ژماره (٢٠٣) ، ٢٠١٣**

**٥٤ — سقيل ، ژماره (١٦٦) ، ٢٠١٣**

**٥٥ — سقيل ، ژماره (٢٦٧) ، ٢٠١٥**

**٥٦ — سقيل ، ژماره (٢٦٧) ، ٢٠١٥**

**٥٧ — سقيل ، ژماره (٣٦٨) ، ٢٠١٥**

**٥٨ — سقيل ، ژماره (٢٥٢) ، ٢٠١٤**

**٥٩ — سقيل ، ژماره (٢٥١) ، ٢٠١٤**

**٦٠ — سقيل ، ژماره (٢٥٣) ، ٢٠١٤**

**٦١ — سقيل ، ژماره (٢٠٩) ، ٢٠١٣**

**٦٢ — سقيل ، ژماره (١٥٤) ، ٢٠١٢**

**٦٣ — سقيل ، ژماره (٢٢٩) ، ٢٠١٤**

**٦٤ — سقيل ، ژماره (٢٤١) ، ٢٠١٤**

**٦٥ — سقيل ، ژماره (٢٤٥) ، ٢٠١٤**

**٦٦ — سقيل ، ژماره (١٩٨) ، ٢٠١٣**

**٦٧ — سقيل ، ژماره (١٥٥) ، ٢٠١٢**

**٦٨ — سقيل ، ژماره (١٥٦) ، ٢٠١٢**

**٦٩ — سقيل ، ژماره (١٥٧) ، ٢٠١٢**

**٧٠ — سقيل ، ژماره (١٥٨) ، ٢٠١٢**

**٧١ — سقيل ، ژماره (١٣٢) ، ٢٠١٢**

**٧٢ — مێرگ ، ژماره (١١) ، ٢٠٠٦**

**٧٣ — مێرگ ، ژماره (١٤) ، ٢٠٠٦**

**٧٤ — مێرگ ، ژماره (١٣) ، ٢٠٠٦**

**٧٥ — مێرگ ، ژماره (١٢) ، ٢٠٠٦**

**٧٦ — سفیل ، ژماره (١٠٧) ، ٢٠١١**

**٧٧ — سفیل ، ژماره (٨٨) ، ٢٠١١**

**٧٨ — سفیل ، ژماره (٩١) ، ٢٠١١**

**٧٩ — سفیل ، ژماره (٢٣٠) ، ٢٠١٤**

**٨٠ — سفیل ، ژماره (٢٣٢) ، ٢٠١٤**

**٨١ — سفیل ، ژماره (٢٣٥) ، ٢٠١٤**

**٨٢ — سفیل ، ژماره (١١٧) ، ٢٠١٢**

**٨٣ — سفیل ، ژماره (١٧٢) ، ٢٠١٣**

**٨٤ — سفیل ، ژماره (١٢٩) ، ٢٠١٢**

**٨٥ — سفیل ، ژماره (٥٣) ، ٢٠١٠**

**٨٦ — سفیل ، ژماره (١٠٩) ، ٢٠١١**

**٨٧ — سفیل ، ژماره (٥٥) ، ٢٠١٠**

**٨٨ — مێرگ ، ژماره (٣٦) ، ٢٠٠٨**

**٨٩ — مێرگ ، ژماره (٧) ، ٢٠٠٥**

**٩٠ — مێرگ ، ژماره (٦) ، ٢٠٠٥**

**٩١ — مێرگ ، ژماره (٥٧) ، ٢٠١٠**

**٩٢ — مێرگ ، ژماره (٥٦) ، ٢٠١٠**

**٩٣ — مێرگ ، ژماره (٤٠) ، ٢٠٠٨**

**٩٤ — مێرگ ، ژماره (٨) ، ٢٠٠٦**

**٩٥ — مێرگ ، ژماره (٩) ، ٢٠٠٦**

**٩٦ — مێرگ ، ژماره (١٨) ، ٢٠٠٦**

**٩٧ — مێرگ ، ژماره (٥٤) ، ٢٠٠٩**

**٩٨ — مێرگ ، ژماره (٥٥) ، ٢٠٠٩**

**٩٩ — مێرگ ، ژماره (٤١) ، ٢٠٠٨**

**١٠٠ — مێرگ ، ژماره (٢٥) ، ٢٠٠٧**

**١٠١ – مێرگ ، ژماره (٤٥) ، ٢٠٠٨**

**١٠٢ – مێرگ ، ژماره (٤٤) ، ٢٠٠٩**

**١٠٣ – مێرگ ، ژماره (٣٩) ، ٢٠٠٨**

**١٠٤ – مێرگ ، ژماره (٥٣) ، ٢٠٠٩**

**١٠٦ – مێرگ ، ژماره (٦٦) ، ٢٠١٠**

**١٠٧ – مێرگ ، ژماره (٦٥) ، ٢٠١٠**

**١٠٨ – مێرگ ، ژماره (٦٧) ، ٢٠١٠**

**١٠٩ – مێرگ ، ژماره (٥٢) ، ٢٠٠٩**

**١١٠ – مێرگ ، ژماره (١٥) ، ٢٠٠٦**

**١١١ – مێرگ ، ژماره (٤٣) ، ٢٠٠٨**

**١١٢ – مێرگ ، ژماره (٢٢) ، ٢٠٠٧**

**١١٣ – مێرگ ، ژماره (٣٤) ، ٢٠٠٨**

**١١٤ – مێرگ ، ژماره (٥١) ، ٢٠٠٩**

**١١٥ – مێرگ ، ژماره (٣٥) ، ٢٠٠٨**

**١١٦ – مێرگ ، ژماره (٣٣) ، ٢٠٠٨**

**١١٧ – مێرگ ، ژماره (٣٢) ، ٢٠٠٨**

**١١٨ – مێرگ ، ژماره (٢) ، ٢٠٠٥**

**١١٩ – مێرگ ، ژماره (٣٧) ، ٢٠٠٨**

**١٢٠ – مێرگ ، ژماره (٢٧) ، ٢٠٠٧**

**١٢١ – مێرگ ، ژماره (٦١) ، ٢٠١٠**

**١٢٢ – مێرگ ، ژماره (٤٧) ، ٢٠٠٩**

**١٢٣ – مێرگ ، ژماره (٧٠) ، ٢٠١١**

**١٢٤ – مێرگ ، ژماره (٢٠) ، ٢٠٠٧**

**١٢٥ – مێرگ ، ژماره (١٧) ، ٢٠٠٦**

**١٢٦ – مێرگ ، ژماره (٤٩) ، ٢٠٠٩**

١٢٧ — مێرگ ، ژمارە (٣٠) ، ٢٠٠٧

١٢٨ — مێرگ ، ژمارە (٣١) ، ٢٠٠٧

١٢٩ — مێرگ ، ژمارە (١٦) ، ٢٠٠٦

١٣٠ — مێرگ ، ژمارە (٤٨) ، ٢٠٠٩

١٣١ — مێرگ ، ژمارە (٢٩) ، ٢٠٠٧

١٣٢ — مێرگ ، ژمارە (٢٦) ، ٢٠٠٧

١٣٣ — ئەکادیمیای کوردستان ، ژمارە (٢) ، ٢٠١٥

١٣٤ — سڤیل ، ژمارە (٩٧) ، ٢٠١١

١٣٥ — سڤیل ، ژمارە (٩٩) ، ٢٠١١

١٣٦ — سڤیل ، ژمارە (١٠٠) ، ٢٠١١

١٣٧ — سڤیل ، ژمارە (١٦١) ، ٢٠١٢

١٣٨ — سڤیل ، ژمارە (١٦٢) ، ٢٠١٢

١٣٩ — سڤیل ، ژمارە (١٦٣) ، ٢٠١٢

١٤٠ — سڤیل ، ژمارە (١٦٤) ، ٢٠١٣

١٤١ — سڤیل ، ژمارە (١٦٥) ، ٢٠١٣

١٤٢ — سڤیل ، ژمارە (٢٣٧) ، ٢٠١٤

١٤٣ — سڤیل ، ژمارە (٢٣٨) ، ٢٠١٤

١٤٤ — سڤیل ، ژمارە (١٠١) ، ٢٠١١

١٤٥ — سڤیل ، ژمارە (١٨٥) ، ٢٠١٣

١٤٦ — سڤیل ، ژمارە (١٨٦) ، ٢٠١٣

١٤٧ — سڤیل ، ژمارە (١٢٥) ، ٢٠١٢

١٤٨ — سڤیل ، ژمارە (١٢٧) ، ٢٠١٢

١٤٩ — سڤیل ، ژمارە (٦٤) ، ٢٠١٠

١٥٠ — سڤیل ، ژمارە (٦٥) ، ٢٠١١

١٥١ — سڤیل ، ژمارە (٦٣) ، ٢٠١٠

**١٥٢ — سڤیل ، ژمارە (٦٢) ، ٢٠١٠**

**١٥٣ — سڤیل ، ژمارە (٦١) ، ٢٠١٠**

**١٥٤ — مێرگ ، ژمارە (٢٨) ، ٢٠٠٧**

**١٥٥ — ڕوناهی ، ژمارە (٣) ، ٢٠٠٠**

**١٥٦ — پێشکەوتن ، ژمارە (٨٠) ، ١٩٩٩**

**١٥٧ — ئاسۆ ، ژمارە (١) ، ٢٠٠١**

**١٥٨ — بەهرە ، ژمارە (١٣) ، ٢٠٠١**

**١٥٩ — پێشکەوتن ، ژمارە (١١١) ، ٢٠٠١**

**١٦٠ — تاوی کۆمەڵایەتی ، ژمارە (٣٧) ، ٢٠١٢**

**١٦١ — تاوی کۆمەڵایەتی ، ژمارە (١٣) ، ٢٠٠٩**

**١٦٢ — تاوی کۆمەڵایەتی ، ژمارە (٧) ، ٢٠٠٩**

**١٦٣ — تاوی کۆمەڵایەتی ، ژمارە (٣٩) ، ٢٠١٢**

**١٦٤ — تاوی کۆمەڵایەتی ، ژمارە (٦٧) ، ٢٠١٥**

**١٦٥ — تاوی کۆمەڵایەتی ، ژمارە (٥٨) ، ٢٠١٤**

**١٦٦ — تاوی کۆمەڵایەتی ، ژمارە (٦٠ — ٦١) ، ٢٠١٤**

**١٦٧ — تاوی کۆمەڵایەتی ، ژمارە (٣٣) ، ٢٠١٢**

**١٦٨ — تاوی کۆمەڵایەتی ، ژمارە (٦٦) ، ٢٠١٥**

**١٦٩ — تاوی کۆمەڵایەتی ، ژمارە (٣٨) ، ٢٠١٢**

**١٧٠ — تاوی کۆمەڵایەتی ، ژمارە (٣٤) ، ٢٠١٢**

**١٧١ — تاوی کۆمەڵایەتی ، ژمارە (٦٤ — ٦٥) ، ٢٠١٤**

**١٧٢ — تاوی کۆمەڵایەتی ، ژمارە (٣٠) ، ٢٠١١**

**١٧٣ — ململانێ ، ژمارە (٤٨) ، ٢٠١٣**

**١٧٤ — ململانێ ، ژمارە (١٤) ، ٢٠١١**

**١٧٥ — ململانێ ، ژمارە (١٨) ، ٢٠١١**

**١٧٦ — زنار ، ژمارە (١٨) ، ٢٠٠٨**

# ناوەڕۆك